

# فەرهەنگا کانی

## کوردیا ژووری - کوردیا ناوەڕاست

دانەر : محەممەد سالح پێندرویی (جگەرسوز)






- ناوی کتێب: فەرهەنگا کانی
- دانەر :محەممەد ساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)
- پیتچنین: مەهدی ئەمیر
- سەرپەرشتی هونەری و بەرگ: عوسمان پیرداود
- نەخشەسازی: عیسام موحسن
- بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (    )
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- لەکتێبخانەی گشتی هەولێر، ژمارەی سپاردنی (        )ی ساڵی (٢٠٠٩)ی داوەتێ
- چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر





- چاپی : یەکەم

دیاری بۆ:

- هەر کەسەکێ حەژ زمانێ کوردی بکەت.

- هەر کوردەکێ پەیڤەکا رەسەنا زمانێ کوردی ڤەژینیت و ژ مرنێ رزگار بکەت.

# پێشەکیی

چاپکردنی "فەرهەنگا کانی کوردی – کوردی" لە دانانی محەممەد سالّح ناسراو بە (جگەرسۆز پێندرۆیی) یەکێکە لە چاپکراوەکانی لیژنەی فەرهەنگ لە ئەکادیمیای کوردی.

ئەم بەرهەمەی مامۆستا جگەرسۆز، وەك فەرهەنگەکانی تر کە بە پەسندکردنی ئەم لیژنەیە دێتە چاپکردن، بە پرۆسەیەکی هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەدا ڕۆیشتووە پێش ئەوەی بریاری چاپکردنی دەربچێت. هیوادارین بەرەچاوکردنی ئەم پرۆسەیە تۆزێك لە ئەرکی دانەرمان کەم کردبێتەوە و هەروەها توانرابێت بە شێوەیەکی زیاتر شایستە ئەم بەرهەمە بخرێتە بازاری فەرهەنگسازیەوە.

ئەم فەرهەنگەی مامۆستا جگەرسۆز پێندرۆیی هەوڵێکی گرنگ و پڕ بایەخە لەبواری فەرهەنگی یەك زمانیدا. نووسەر هەردوو شێوەزاری کرمانجی ناوەند و سەروو بە (ئاخاوتن) و (نووسین) چاك دەزانێت. بەو دوو شێوەزارە زۆر بابەتی بڵاوکردووتەوە و چەند کتێبێکی نووسیوە و دەسەڵاتی بەسەر هەردوو شێوەزارەکەدا زۆر دیارە. لەم ڕوانگەوە چاپکردنی ئەم فەرهەنگە خەزێنەیەکی زمانەوانی دەبەخشێت بە فەرهەنگی کوردی.

لە ڕوانگەی پێویستیی بەرهەمهێنانی فەرهەنگێکی نەتەوەییەوە، لیژنەی فەرهەنگ ئەم کارەی مامۆستا جگەرسۆز بە یەکێك لەو سەرچاوانە دادەنێت کە سەرەتای کاری فەرهەنگی نەتەوە پێك دەهێنن.

زمانی کوردی خاوەنی چەند شێوەزارێکە. لە هەمان کاتدا ئەرك و کێشەی دروستبوونی زمانێکی ستاندارد، یەکێکە لەو بابەتانەی کە ماوەیەکە لەنێوان زمانەوان و میدیای کوردی لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان باسی لیّ دەکرێت. سروشتیە کە دەزگایەکی وەك ئەکادیمیای کوردی بەشێك بێت لەو کۆڕی باسکردن و لێکۆڵینەوەیە لە

زمانی کوردی، و لەو بوارەدایە کە چاپکردنی ئەم فەرهەنگە وەك هەنگاوێکی خزمەتگوزار دەبینرێت.

فراوانبوونی پەیوەندی و پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژی و پێداویستیی زمانی ڕۆژانە، ئەرکی دۆزینەوەی زاراوەی نوێی لای هەموو گەلانی جیهان پێویست کردووە، بۆیە دەبینین کار و بەرنامەی زاراوەسازی لە برەودایە و کەموزۆر دەوڵەتان و وڵاتانی دونیا لەم ڕێگایەوە زمانی خۆیان بۆ پێداویستیەکانی سەردەم ئامادە و دەوڵەمەند دەکەن. ئێمەش لەو بڕوایەوە کە چاپکردنی ئەم فەرهەنگە و بەرهەمی تری هاوشێوە بەشێك لەم کەلێنە پڕ دەکەنەوە، بۆیە هەستاین بە ئەرکی چاپکردنی.

بۆ نەتەوەیەکی وەکوو کورد لەوانەیە سەرەتای کار پێویست بێت کە خودی کۆمەڵی ئەم میللەتە زیاتر ئاشنابن لە شێوەی قسەکردنی یەکتر، و تێگەیشتن بە شێوەزارەکان زیاتر لەناویاندا بەدەست بێت. ئەمەش هۆکارێکی ترە کە ئێمە لەم ڕەوشەی ئێستادا چاپکردنی "فەرهەنگا کانی کوردی– کوردی" بە کارێکی پێویست و خزمەتکەری ئەو ئامانجە دەزانین. لەهەمان کاتدا لیژنەی فەرهەنگ، بۆ زیاتر گرنگیدان بەهەموو شێوەزارەکان و ئاشناکردنیان بە یەکتر، سەرقاڵی چاپکردنی فەرهەنگی شێوەزارەکانی ترە.

لەگەڵ دەستخۆشیکردن لە مامۆستا جگەرسۆز، "فەرهەنگا کانی کوردی– کوردی" بە خوێنەران دەسپێرین.

**لیژنەی فەرهەنگ**

## دەستپێك

فەرهەنگ دۆستێن خوشتڤی ، زمان پێناس و ناسناما هەر گەل و نەتەوەکییە ، چونکی بێی هەبوونا زمانی چ مللەت نکارن هەبوونا خۆ بسەلمینن وهەتا ئەبەد بمینین ،تشتەکێ عەیانە و ناهێتە ماندەلکرن کو(فەرهەنگ) بەرێ بنیاتێ پاراستنا زمانییە و سەدەمەکێ هەری ب هێزە ژی بۆ وەرار وگولڤەدان و زەنگینبوونا وی ، لەوما ئەگەر هەبوونا فەرهەنگێ بۆ گەلێن خودان قەوارە و دەولەت پێدڤی بیت ، بۆ مە کوردا شەنگستێ ژیانێ ومانێ یە، ژبەرکو نە مە هێشتا قەوارەکێ سەربخۆ هەیە ، نە ئەم خودانێن زمانێکێ زانستی و ستاندەرد و هەڤگرتینە ، هەروەسا نە مە فەرهەنگەکا نەتەوەیی ژی هەیە کو تەڤایا پەیڤێن زمانێ کوردی دناڤ رووپەلێن خۆدا هەلگریت و ڤێ ڤالاهیێ پڕ بکەتەڤە ، ڤێجا فەرە ب ڤی چاڤی بنێرینە فەرهەنگێ و مینا پڕۆژەکێ نەتەوی ونیشتمانی بێخەینە بەراهیکا کارێن خۆ یێن ستراتیژی.

هێژایان، ئەز ب فەر دزانم هاڤرپا هەوە بۆ ڤان چەند خالێن خارێ رابکێشم :

١ – هەلبەت دانانا فەرهەنگێ کارەکێ کەتکەسی و فەردی نییە، بەلکی کارێ کۆمەکا کەسێن زمانزان و پسپۆرە ، یان ژی راستتر بێژم کارێ ناڤەندەکا زانستی و رەوشەنبیری و زمانەڤانییە، مینا (ئەکادیمیا)یێ ، کو ڤی ئەرکێ پیرۆز بگریتە ستوویێ خۆ، چونکی سەرەدەریکرن دگەل زمانی کارەکێ هەستیارە و بەرپرسیاریەتیا وێ ژی یا سەنگین وگرانە ، لێ ژ بەر دلسۆزییا من بۆ زمان و نەتەوە و وارێ خۆ، ئەرکێ دانانا ڤێ فەرهەنگێ من ئێخستە ستوویێ خۆ.

٢– زمانێ کوردی زمانەکێ فرە دیالێکتە وخودانێ چەندین شێوەزارێن جودا جودایە، هەر شێوەزارەك ژی روویبارەکێ بۆشە ل دەریایا زمانێ کوردی،لەورا پشت ڕاستیڤە دکارم بێژم زمانێ مە ئێکە ژ زمانێن دەولەمەند وزیندیێن جیهانێ، لێ حەیف و مخابن ژ بەر بناسە وسەدەمێن رامیاری و سیاسەتا ڤەگرتنێ وپارڤەکرنا کوردستانێ ژ ئالیێ کۆلۆنیالیزمێ وکولەدارانڤە، ئەم نەکارینە ب ئاوایەکێ زانستیانە و بابەتیانە سەرەدەریێ دگەل شێوەزارێن خۆ بکەین و ژ بۆ ب هێزکرن و زەنگینکرنا زمانێ خۆ

مفای ژێوەربگرین، بەروڤاژی، ل جیاتی ئەڤ فرە دیالێکتییە ببیتە خالا ب هێزبوونا مە ، یا بۆیە خالا رێسریان و بێ هێزی و تەڕابەڕا بوونا مە، هەتا پارا پترا وان کەسێن ب ڤان شێوەزاران دئاخفن ل هەڤ ناگەهن ، هەر وەسا پڕانیا تورەڤان و نڤیسکار و رۆژنامەڤانێن مە ژی ئەوێن ب کرمانجیا ژووری و کرمانجیا ژێری بەرهەم ونڤسیاندنێن خۆ د وەشینن نکارن مینا پێدڤی بەهرێ ومفای ل نڤیسین وبیر و هزرێن هەڤ وەرگرن ، لەوما فەرە ئەڤ ئاریشە بهێتە چارەسەر کرن ، دا کو ئەڤ ڤالاهیا مەزن پڕ ببیتەڤە ، هیڤیدارم فەرهەنگا( کانی) ببیتە پرەکا موکوم و پتەو بۆ چێکرنا ڤێ هەڤبەندییا ب هێز.

٣– ئەڤرۆ ل کوردستانێ ل سەر هەمی ئاستەکی گەلەك باسێ چێکرنا زمانەکێ هەڤگرتی دهێتەکرن ، چونکی هەتا نها ژی دگەل دابیت مە زمانێکێ ب ڤی ئاوایی نییە کو ببیتە زمانەکێ فەرمی یێ (نڤیسینێ وخویندنێ و ڤەخویندنێ) بۆ تەڤایا خەلکێ کوردستانێ ب تەڤ پێکهاتەو تەخانڤە، لەوڕا ئەم حەوجەی ڤان تەرزە فەرهەنگاینە، دا کو د پاشەرۆژێدا ببنە سەدەمەکێ هاریکار ژ بۆ هنگافتنا ڤێ ئامانجا پیرۆز.

٤– هەر چەندە فەرهەنگا کانی یا ب ( کرمانجیا ژووری ، کرمانجیا ژێری) هاتیە دانان ، لێ یا راست فەرهەنگەکا (کوردی– کوردی)یە، ژبەرکو نە مەرجە هەمی پەیڤێن ڤێ فەرهەنگێ هەر ژ تیپا ئەلفێ هەتا یایێ دناڤ کرمانجیا ژووری و کرمانجیا ژێریدا هەبن، لەوڕا هەبوونا پەیڤێن دی یێن کوردی بۆ دەوڵەمەندکرن وزەنگینکرنا فەرهەنگا کانی هاتینە نڤیساندن ، ڤێجا فەرە راستییا ئیماژە پێکری بهێتە ل بەرچاڤ گرتن .

٥– بۆ دانانا فەرهەنگا کانی، بژلی ئەو زانیارییێن من ل سەر ئیدیەم و پەیڤێن کوردی هەی، من ژ چەندین ژێدەر وچاڤکانییێن دی یێن جودا جودا مفا وەرگرتییە،مینانی فەرهەنگێن (کوردی–کوردی) و(کوردی–عەرەبی) و(کوردی–فارسی) و(کوردی–ئینگلیزی)، هەروەسا دیوان وپەرتووکێن تورەیی وئەدەبی ورەوشەنبیری، فەرهەنگا گوندی یا،مەبەستا من ژ فەرهەنگا گوندی یا، زمانێ پالە وجوتیار ورێنجبەر وکارکەر وگوندییێن مەیە، ئەوێن هەتا نها کاری زمانێ خۆ یێ رەسەن ب سەر بلندی بپارێزن.

٦ — زۆر پەیڤێن ڤێ فەرهەنگێ رەنگە دبنەکۆکێدا یەك بن، لێ چونکی ل هەر دەڤەرەکێ ب شێوەیەکێ جودا دهێنە ڤەخاندن،هەروەسا ئەگەر نەهێنە تۆمارکرن ژی،رەنگە رۆژەکێ ل رۆژا ل ناڤ بچن، لەوڕا من ب فەر زانی هەمی وان پەیڤێن ئەز دزانین ل سەر رووپەلێن فەرهەنگا کانی تۆمار بکەم، بۆ میناك: پەیڤا ( بلی،بژلی،ژبل،بلۆژ...) ئەڤ پەیڤە زۆر ل هەڤ نێزیکن،لێ ل هەر درەکێ ب ئاوایەکێ دهێنە گۆتن.

٧- د ڤــیٚ فەرهەنگێــدا زۆر کــێم ئیمــاژە ب رێــسا وبنــەماییٚن رێزمــانیٚ کــوردی هاتیەکرن، چونکی من پتر کار بوو کۆمکرنا پەیڤان کریە،لەوڕا ئەز ئێکسەر ل سەر پەیڤا سەکنیمە و،مـن پێکـۆل کریـە هەڤبەرکرنـەکیٚ دناڤبـەرا پتریـن پـەیڤێن دوو شـێوەزاراندا بکەم، کو ئیرۆ هژمارەکا زۆر ژ کوردان پیٚ دئاخڤن،هیڤیدارم ئەڤ کـاریٚ مـە ببیتـە بـەریٚ بنیاتیٚ ل هەڤ گەهیشتنیٚ ول هەڤ نێزیکبوونیٚ و چێبوونا زمانەکیٚ هەڤگرتی کو خەونـەکا دێرینا هەر کوردەکیٚ دلسۆزە.

٨- فەرە بێژم  بۆ هەر پەیڤـەکا کرمانجیـا ژووری ،مـە خـەبتین کریـە پەیڤـەکا هـەڤ رامان و هەڤ واتایا ویٚ ب  کرمانجیا ژێری بەرانبەری ویٚ بنڤیسین،ئەگەر چ پەیڤ دەست مە نەکـەفتن بن،مـە پێکـۆل کریـە راڤـەکا کـورت بدەینیٚ،هنـدەك جـارا ژی مـە چـەندین پەیڤێن کرمانجیا ژووری دگەلٚ پەیڤێن کرمانجیا ژێری هەڤتا و رێزکرینە، دا فەرهەنگ پتر دەولەمەند ببیت وئەو پەیڤ ژی ژ مرنەکا مسۆگەر بهێنە پاراستن،هەروەسا بۆ خۆیاکرنا رامانا زۆر پەیڤا مە مفا ژ پەندێن کوردی وەرگرتییە و بۆ هنـدیٚ ژی کـو وان پەنـدا نـاس بکــەین، مــە تیپــا(پ)بەرانبــەری وان نڤیــساندییە،ئەگەر مــە ئیمــاژە ب هەڵبەســتا هەڵبەستڤانەکی ژی کربیت،ئیماژە ب ناڤیٚ وی هاتیەکرن.

٩- دەمیٚ مە بناغیٚ فەرهەنگا کانی داناى،هەمی حـەز وهیڤیـێن مـە ئـەو بـوون ئـەم هـەوارا خـۆ بـۆ چ پـەیڤ وئیدیـەمێن بیـانی نەبـەین و، بتنـیٚ مفـای ژ پـەیڤێن رەسـەن وبێگـەردێن کـوردی وەرگـرین، لیٚ تـشتەکیٚ عەیانـە چ زمـانێن جیهانیٚ،ئەگـەر ئـەو زمـان چڤاسی ساخ وزیندی ودەولەمەند ژی بن مینانی: زمانیٚ ئینگلیزی و فەرەنسی و روسی و عەرەبی وفارسی و...تاد. نەد ڤالاٚنە ژ پەیڤێن بیانی و کێم وزۆر پەیڤێن بیانی تێدا هەنە وئەڤ دیاردە لدەڤ هەمی زمانا هەیە وتشتەکیٚ سروشتییە ژی، لـەوما ئـەو پـەیڤێن بـەری سەدان سالاٚن هاتینە دناڤ زمانیٚ کوردیدا،ئـەم ناهـەژمێرین پـەیڤێن بیـانی، چـونکی بـێن بوینە پشکەك ژ زمانیٚ مە بیٚ نەتەوی،ڤێجا ئەگەر پەیڤەکا هۆسا کەفتە بەر چاڤیٚ هـەوە ب تشتەکیٚ سروشـتی بـزانن و وەکـی پەیڤـەکا کـوردی سـەرەدەرییٚ دگەڵـدا بکـەن،مینا پەیڤا (قەلەم، دەفتەر، مەکتەب، خیار، رسمی، نفوس ومختار و عەبا و بێن شتی ڤانە.

هەرگاڤا ئەم شیاین ژی ب کوردی پەیڤێن جوانتر ل جهیٚ وان دانـین، ب مەرجـەکی ببنـە جهـ ڤەگر(بدیل)ێن پەیڤێن بیانی، هنگی ئەم هەمی دیٚ ب شانازیڤە د پەیڤین ونڤێـسینێن خۆ دا بکارئینین،لیٚ ب دیتنا من نها تشتەکیٚ نەییٚ دجهیٚ خـۆ دایـە ئـەم دەربـارەی ڤـان پــەیڤا هەسـتیارییٚ نیـشان بـدەین و ب خـۆرتی دنـاڤ زمـانیٚ خـۆ دا دەربێخین،بـۆ پـشت

ڕاستکرنا گۆتناخۆ یا سلال ژی دێ پەیڤا (قەلەم) کەینە نموونە،هەر چەندە مە بەدەل پەیڤا قەلەم پەیڤا (خامە) و(پێنڤیس) هەنە،لێ بەلێ ئەم هەمی دزانین هێشتا قەلەم ل کارە و چ ل سەر ئاستێ رەوشەنبیری وئەکادیمی، چ ل سەر ئاستێ میللی و دناڤ خەلکیدا، خامە وپێنڤیس نەکارینە ببنە بەدیلێن (قەلەم)ی و هێشتا ئەڤ پەیڤە مینا پێدڤی ل سەر زارێ مە کەهی نەبووینە، ئەڤە ژ ئالیەکی، ژ ئالیەکێ دیڤە بۆ گۆتن ونڤێسینا هندەك پەیڤا ئەم نەچار بووینە پەنایێ بۆ زۆر پەیڤێن بیانی ببەین،چونکی مە بەدیلێن وان ب کوردی نەبووینە، ڤێجا ب دیتنا من زڤڕینەڤا مە بۆ ناڤەندێن ئەکادیمی یێن زماننیاسی و فەرهەنگا گوندییا دێ هەتا رادەکێ باش هاری مەکەت کو ئەم زمانێ خۆ یێ رەسەن بپارێزین وهێدی هێدی ڤێ ئاریشێ چارەسەر بکەین.

١٠- ئەگەر هەوە پەیڤەك ڤییا و دناڤ فەرهەنگا کانیدا دەست وە نەکەفت، ب تشتەکێ سروشتی بزانن، چونکی یا زانایە مە هێشتا چ فەرهەنگێن نەتەوەیی یێن گشتگیر(شامل) نینە، کو پترین پەیڤا بێخیتە بەر دەستێ مە،هەروەسا ئەڤ فەرهەنگە وییێن شتی ڤێ ژی چقاسی د مەزن وتڤاڤ بن، نکارن هەمی زمانی دناڤ رووپەلێن خۆ دا هەلگرن وکۆمبکەن، ڤێجا بلا هەر یەك ژ مە بۆ دانانا بەرێ بنیاتێ فەرهەنگەکا نەتەوەیی کار بکەین ود کارێ خۆ دا ژی خەمخۆر و دلسۆز بین.

١١-مسۆگەر فەرهەنگا کانی یا بێ کێماسی و شاشی نییە، لێ "سیار هەتا نەکەڤیت نابیتە سیار"، لەوڕا پڕ ژ دل حەز دکەم فەرهەنگنڤێس و زمانزانێن کورد ڤێ فەرهەنگێ هەڵسەنگینن و ب شەنا قەلەمێن خۆ یێن تیژ بێدەرا وێ بدەنە بای، دا ژ تشتێ نەژهەژی و نە سەبقی بهێتە ئادە و بژارە وپاقژکرن، هەروەسا دا کو ل چاپێن بێتدا بەهرێ و مفای ژ بیر وهزر و تێدیتن وزانیارییێن وان وەرگرم ، ژبەرکو من لبەرە ئەگەر خودێ حەز بکەت د پاشەرۆژێدا سنوور وکەوشەنێن فەرهەنگا کانی بەرفرەهـ بکەم و کاکلك و ناڤەرۆکا وێ زەنگین و دەولەمەند بکەم، هەروەسا فەرە بێژم ئەز نها مژوول وخەریکی دانانا فەرهەنگەکا دیی یا (کوردی-کوردی) مە،لێ ڤێ جارێ ب(کرمانجیا ژێری- کرمانجیا ژووری)یە، ڤێجا بۆ برینا ڤێ قویناغا ئاسێ مە سیارێن زیخ و شارەزا وچەلەنگ و بستە و دەستپل وچاڤزل دڤێن،هیڤیدارم هەر یەك ژ مە ئەڤ سیارێن زیخ وبستە و چەلەنگ بین، دا بکارین ب جوانترین وباشترین شێوە خزمەتا زمانێ خۆ یێ خۆش وشرین بکەین.

١٢- ل وى دەمێ من فاماندى وخۆنياسكرى،من حەژ زمان خۆ كريە ومن ڤيايە خزمەتا زمانێ كوردى بكەم،نەمازە پشتى ئەم چووينە خاندنخانێ و پەيڤێن شرينێن كوردى ل سەر لێڤێن مە كەهى بووين، لێ هەر زوى هێشتا ژيێ من دە سال بوو، دەمێ ئەم كەفتينە بەر لەهى ولێسەرا ستەم و زۆرداريا رژێما سەددامێ گۆڕ بگۆڕ و سالا ١٩٧٨ز گوندێن مە ل دەڤەرا (مزويرى بالاّ) كاڤل و وێران كرين و ئەم راپێچى كۆمەلگەها ب خۆرتى چێكريا (بەحركێ) كرين، دوژمن ب وێ چەندێ ژى نەسەكنى ول سالا ١٩٨٧ئەم نەچار كرين بەرەف كوردستانا بندەستێ ئيرانێ كۆچ بكەين و ل بازێڕێ ورمێ ئاكنجى ببين، حەزا خزمەتكرنا زمانێ كوردى دناڤ دلێ مندا هەرا خۆرت بوو،لێ وى دەمى دەليڤە يا بەر تەنگبوو كو د بياڤێ فەرهەنگێدا كار بكەين وخزمەتا زمانێ كوردى بكەين، هەتا سالا ١٩٩٤ز ،هنگى بۆ مە دەليڤە ودەرفەت هاتە پێش ،كو پرسا زمانى بكەينە ئێك ژ خەمێن خۆ،لەورا دانانا بناغە وشەنگستێ ڤێ فەرهەنگێ بۆ هنگى دزڤڕيتەڤە، هەژى ئيمازە پێكرنێيە مشەختبوونا مە يا بێ مفا نەبوو،ئێك ژ وان مفايان ئەو بوو، ئەم شياين بۆ زەنگينكرنا فەرهەنگا كانى مفايەكێ زۆر ل پەيڤێن كوردى يێن وێ دەڤەرێ وەرگرين.

١٣ — فەرهەنگا كانى پتر ژ (١٣٠٠٠) پەيڤ وئيديەما تێدا هەنە، بژلى ئەو پەيڤێن مە بۆ دەولەمەندكرنا فەرهەنگێ دگەلێ پەيڤێن هەڤتا(مرادف) نڤێسى، كو ئەو ژى گەلەك زۆرن.سۆپاس بۆ خودێ پشتى خەبتێن و مانديبوونەكا زۆر، فەرهەنگا (كانى) شيا چاڤێن خۆ ڤەكەت و بێتە گۆڤەندا پەرتووكخانا كوردى، لەورا هيڤيدارم يا ژ هەژى ڤێ گۆڤەندێ بيت و بكاريت تێهن وگەرمييەكا زۆر بدەتە زەند وباسكێن خويندەڤانێن هێژا و تێنيشكا هەژى وهەزرێن وان بشكێنيت و زمانێ كوردى پتر ل دەڤ وان شرين بكەت،هەروەسا ئومێدەوارم ڤالاهيەكا بچويك ژى دناڤ پەرتووكخانا كورديدا پڕ بكەتەڤە و دلێ هەر كوردەكێ زماندۆست وكوردپەروەر و وەلاتپارێز خۆش بكەت .

**محەممەد سالح پێندرۆيى ( جگەرسۆز )**

**هەولێر ٢٠٠٩**



| کوردی (کرمانجییا ژووری) | کوردی (کرمانجییا ژێری) |
|---|---|
| ئا | بەڵێ |
| ئاپ | مام |
| ئاتاف | بەڵا ، مۆسیبەت |
| ئاتوون | هێتوون |
| ئاخ | داخ و ئازار |
| ئاخ | خۆڵ |
| ئاخدار | دەردەدار ، داخدار |
| ئاخرەت | ئاخیرەت ، رۆژی پەسەلان |
| ئاخڤاندن | هێنانە ئاخاوتن، هێنانە قسە |
| ئاخفتن | قسەکردن ، پەیڤین |
| ئاخڤتن خۆش | قسە خۆش ، زمانپاراو |
| ئاخلە | خەرمان،جوخین، بێدەر |
| ئاخلەویك | تاوەی شت تێدا سوورکردنەوە |
| ئاخلێڤە | بەهارێکی زوو ،تێرە خۆری ئاژەڵ ، خاکەلێوە |

ئاخوير مۆلگە ، تەوێڵە

ئاخويرك جۆرە پێشكەيەكی زۆر وردە ، ئاخركە

ئاخەبان گڵەبان

ئاخەسپيك خۆڵەسپی

ئاخين ئاخ هەڵكێشان ، دەردو حەسەرەت ، كەسەر

ئادە بژارەكردنی گيا لەشينايی

ئار ئارد

ئاراڤ ئەو ئاوەی بۆ دووەم جار بەكاردەهێنرێت

ئاراندن ئێشاندن ، ئازاردان ، وروژاندن

ئارپێژ ئاردبێژ

ئارخاڤك چێشتی ئاردو رۆن

ئارخايين دڵنيا ، خاترجەم ، پشتڕاست

ئارزی ئارەزوو

ئارڤان ئاردچی ، ئاردكار

ئارمانج نيشانە

ئارمانج مەبەست

ئارمانجانیٚ نيشانە داكردن

ئارمانجدار مەبەستدار

ئارميتە ئامێری دەرهێنانی كەنگر ، دارێكی سەر ئاسنە بۆ دەرهێنانی كەنگر

ئارهان هەوكردنی برين

ئارەق مەی ، شەراب

ئارەقە ئارەقەی لەش لەكاتی گەرمادا

| | |
|---|---|
| ئاریان | رەگەزی ئاری |
| ئاریان | برینی بەچڵك و كێم و جەراحەت، ئازریان |
| ئاریان | هەوكردن ، ئازار |
| ئارێشە | كێشە ، گرفتاری ، گیروگرفت |
| ئاریكار | یاریدەدەر، هاوكار |
| ئاریكاری | هاوكاری ، یارمەتی |
| ئارینك | وڕك ، گریانی منداڵ بە بەردەوامی، گڕۆز ، ئارۆنە |
| ئاری | یارمەتی ، هاوكاری ، هاری |
| ئاری | نەژادی هیندو ئەوروپی |
| ئازاكرن | پاكانە ، گەردەن ئازایی |
| ئازراندن | ورووژاندن |
| ئازری | وورووژا |
| ئاژۆتن | لێخوڕین |
| ئاغلیك | بڕوانە: ئاخلەویك |
| ئاساس | بناغە ، شەنگەستە، بنەتار |
| ئاستەنگ | جێگای سەخت و دژوار |
| ئاستەنگ | تەنگ و چەڵەمە ، كۆسپە ، لەمپەر |
| ئاسنەرێ | هێڵی ئاسن ، هێڵی شەمەندەفەڕ |
| ئاسندڕك | تەلبەند ، تێلدڕی |
| ئاسنقۆت | ئاسنگەر |
| ئاسنسم | ئاسن كونكەر |
| ئاسنكێش | مۆگناتیس |

| | |
|---|---|
| ئاسوید | جۆرە خۆراکێکی بە تامی خۆماڵییە |
| ئاسیدە | ئاسوودە ، تەنا |
| ئاسێگەھ | قەلاٚ ، کەلا |
| ئاسیمان | ئاسمان |
| ئاسیٚ | سەخت |
| ئاشئاشۆك | گەڕۆك |
| ئاشخان | چێشتخاتە |
| ئاشڤان | ئاشەوان |
| ئاشك | گەدە،ورگ |
| ئاشکرن | ئاشتکردنەوە |
| ئاشکرا | دیار،ئەشکەرە،عەیان،خۆیا |
| ئاشویت | رەنی ، روخانی بەفر ، رەنۆ |
| ئاشۆپ | ئەندێشە،خەیاڵ |
| ئاشیڤ | ئامادەکردنی زەوی بۆ کێلاٚن |
| ئاشیف | بژارە ، ئادە ، تەتەڵە |
| ئاشهێر | ئاشەوان،ئاشەڤان |
| ئاغا | سەرۆك هۆز ، گەورەی هۆز |
| ئاغلەبە | زۆرینە ، پڕانی |
| ئاغلەویك | تاوەی شت تێدا سوورکردنەوە |
| ئافراندن | داهێنان ، چێکرن |
| ئافرەندە | پەروەردگار |
| ئافرندە | داهێنەر |

| | |
|---|---|
| ئافزە | كانياو |
| ئاڤ | ئاو |
| ئاڤا | ئاوەدان |
| ئاڤا بەفرێ | بەفراو |
| ئاڤاتەزی | ئاوی سارد |
| ئاڤاکەر | بنیادنەر |
| ئاڤاندن | تواندنەوە |
| ئاڤاهی | ئاوەدانی |
| ئاڤباز | مەلەوان ، مەلەڤان |
| ئاڤبەز | ئەو ئاوەی کە بە رەوانی دەڕوات |
| ئاڤپاشدانك | ئەو دارانەی لەکاتی لێخوڕین وجووڵە پێکردنی بەلەم بەکاردەهێنرێت |
| ئاڤپەنگ | ئەو شوێنەی کە ئاو تیایدا پەنگ دەخواتەوە |
| ئاڤپەنگ | ئاوی باران، قوولکەی ئاو |
| ئاڤتەزۆك | بەفرگر |
| ئاڤخیز | ئاوی مەنگ کە لە بەر نەڕوات |
| ئاڤچزك | فوارە |
| ئاڤدار | بەئاو |
| ئاڤدانك | دەفری ئاو، سەتل، پەقرەج، زەرك،سیتل |
| ئاڤدەست | ئاودەستخانە،ئەدەبخانە |
| ئاڤدەڤ | مەتارە، دێمکە |
| ئاڤدەل | ئاوگێڕ ، ئاودەر |
| ئاڤدین | تۆڵە سەندن |

| | |
|---|---|
| ئاڤڕۆندك | گریانی بەکوڵ |
| ئاڤڕابوون | لافاو ، لێسەر ، لەهی ، لێمشت |
| ئاڤڕێ | لاڕێ، باریکە ڕێ |
| ئاڤڕەشینك | ئاو پرژێن |
| ئاڤڕوی | ئابڕوو،شەرەف،nاموس |
| ئاڤڕی | ئاور ،سەرنج |
| ئاڤڕێژ | ئاودەستخانە |
| ئاڤڕێژ | ئاوڕێژ |
| ئاڤزێم | کوێرەکانی |
| ئاڤژەن | مەلەوان |
| ئاڤس | ئاوس ،دووگیان |
| ئاڤسارك | ساردکەرەوە ، بەفرگر |
| ئاڤشۆ | چڵکاو |
| ئاڤشیلە | ئاوی میوە |
| ئاڤك | مەرەگە، شلە |
| ئاڤکی | ئاوکی |
| ئاڤگر | ئاوگر ، کۆگای ئاو |
| ئاڤگیر | ئاوی میوە |
| ئاڤنگە | غەم ، کۆڤان |
| ئاڤەند | شایان ، شایستە |
| ئاڤەند | پایە |
| ئاڤێتن | هاوێژتن ، فڕەدان |

| | |
|---|---|
| ئاڤێستا | ئاوێستا ، پەرتووکی زەردەشت |
| ئاڤێش | دەرمان |
| ئاڤیڤان | ئاوکێش |
| ئاڤێر | بڕوانە ڤاڤێر |
| ئاڤی | بەراو ، ئاوی |
| ئاقار | شوێنی باغ و بێستان،عاستی شت |
| ئاقل | دانا ،هۆشمەند |
| ئاقد | مەزاری گەورە پیاوان،کە بەشێوەی کەوانەیی دروست کرابێت |
| ئاقید | شیلەی میوەی نایاب |
| ئاکنجی | نیشتەجێ |
| ئاکنجیگەه | شوێنی نیشتەجێبوون |
| ئاگر پەرێس | ئاگر پەرست |
| ئاگرۆك | ئامرازی ئاگر پێکردن |
| ئاگردانك | ئاگردان |
| ئاگرڤان | پاسەوانی ئاگرخانە |
| ئاگەهی | ئاگاداری |
| ئال | ڕەخ ، لا ، تەنیشت |
| ئالا مالا | ئیلا بیلا |
| ئالادار | خاوەن ئالآ ، پەرچەمدار |
| ئالاستن | لێستنەوە ، لێستن |
| ئالاڤ | ئامراز ، ئامێر |
| ئالآندن | پێچان |

| | |
|---|---|
| ئالزی | ئالۆزبوو ، شلەژا |
| ئالف | خواردەمەنی مەڕومالآت |
| ئالف | ئالیکی ئاژەڵ |
| ئالفدەر | ئالیکدەر |
| ئالۆز | شلەژاو،دژوار،سەخت |
| ئالۆز | تێکئالاو |
| ئالۆزی | شلەژاوی |
| ئالۆزی | تێکئالاوی |
| ئالووتە | بڕوانە ئارمیتە |
| ئالیستن | لیستنەوە |
| ئالیستن | ئالاستن |
| ئالیف | ئالیك ، خۆراکی ئاژەڵ |
| ئالیکار | هاوکار ، یارمەتیدەر، هاریکار |
| ئالینۆك | لەتکەنۆك، لەپە |
| ئالی | لا،رەخ ، تەنیشت |
| ئالا | بەیداغ ، پەرچەم |
| ئالاکۆك | کۆلان، کۆچە، زکاك |
| ئامار | سەرژمێری |
| ئامان | قاپ و قاچاغ |
| ئامەد | ناوی شاری (دیاربەکر)ە لە کوردستانی باکوور |
| ئامیر | ئامێر |
| ئامیر دەست | داردەست ، بەکرێ گیراو |

| | |
|---|---|
| ئان | یان |
| ئانکۆ | واته ، خۆزکۆ |
| ئانەت | سەرکەش ، شەمبۆز، دەستنەخۆش ، |
| ئانەتی | سەرکەشی، شەمبۆزی ، دەستنەخۆشی |
| ئانەتیکرن | سەرکەشیکردن، ئازار گەیاندن، دەستنەخۆشی کرن |
| ئانەه | هاوکار ، یارمەتیدەر |
| ئانەهی | یارمەتی،هاوکاری |
| ئانیشك | بەندی نێوان قۆڵ و باسك |
| ئانین | هێنان |
| ئانی | هێنا |
| ئاهین | دەردو حەسەرەت |
| ئاوڕ، ئاڤڕ | تێبینی |
| ئایدیال | نموونە |
| ئایش | هێور |
| ئایشبوون | هێور بوونەوە |
| ئزن | مۆڵەت ، روخسەت ، دەستوور |
| ئزندان | مۆڵەتدان ، ڕێگە پێدان ، دەستووردان |
| ئستران | گۆرانی ، کلام |
| ئستری | درك ، کەلەم ، ستری |
| ئستەور | ستێوور، لەشیروەستانی مەڕومالاتی شیردەر |
| ئستەیرك | ئەستێرە |
| ئم | پیتی وەلاّم دانەوە ، بۆ سەرسوڕمان بەکاردێت |

| ئندا | بزر ، گوم ، وندا ، بەرزە ، نادیار |
| --- | --- |
| ئنیەت | نیاز ، نیەت ، مەرام |
| ئنیەت باش | نیازچاك |
| ئنیەت پیس | نیاز خراپ |
| ئنیەتئینان | نیەت هێنان |
| ئوسان | واها ، ئاوا |
| ئوستوو | گەردەن ، ئەستوو ، ستوی،ستوکورك |
| ئول | وەچە ، بەچکە |
| ئوور | ورگ ، زگ ، بێ تاوان |
| ئویجاخ | بنەماڵە ، بەرەباب |
| ئویچ | زۆر خۆر ، بێ نەفس |
| ئۆباڵ | گوناه |
| ئۆبە | کۆمەڵە |
| ئۆخەیش | ئۆخەی |
| ئۆدا | دایکە ، دایە |
| ئۆدە | ژوور |
| ئۆرت | لا ، رەخ ، کەنار ، تەنیشت |
| ئۆغر | سەفەر ، کۆچ، وەغەر |
| ئۆل | ئایین |
| ئۆلڤان | ئایین پەروەر |
| ئۆیین | پیلان ،نەخشە |
| ئەبدال | عەوداڵ |

| | |
|---|---|
| ئەختەر | ئەستێرەی بەخت |
| ئەختوبار | بە ئەمەك ، وەفادار |
| ئەخچە | جۆرە پارەیێکی کۆنە |
| ئەخرین | لەغرین،بەرتێشت، ئەوەی ژەمی بەیانی نەخواردبێ |
| ئەداڤ | کێم و عەداب |
| ئەدرێس | ناوونیشان |
| ئەدەب | شەرم و حەیا ، ناموس |
| ئەدەبخانە | ئاودەستخانە |
| ئەدەبدان | ئەدەبکردن ، تەنبێ کردن |
| ئەرخ | چاڵ |
| ئەرخین | لەغرین، بەرتێشت، ئەوەی هێشتا نانی بەیانی نەخواردبێت |
| ئەرد | هەرد، زەوی، عەرد |
| ئەردهژیان | بوومەلەرزە ، بیبەلەرز |
| ئەرزان | هەرزان |
| ئەرزێنك | چەناگە |
| ئەرڤاز | ئەوراز ، ژێهەلی |
| ئەرمووش | ئاوریشم ، ئەبریشەم |
| ئەرێ | بەڵێ |
| ئەز | من |
| ئەزبەرکرن | لەبەرکردن |
| ئەزبەنی | گەورەم،مەزنێ من |
| ئەزگوری | قوربانت بم ، بەساقەت بم |

| | |
|---|---|
| ئەزم | منم |
| ئەزمام | من مامەوە |
| ئەزمان | زمان |
| ئەزمانخۆش | رەوانبێژ ، قسەپاراو ، زمانپاراو |
| ئەزمانسوورك | ئادەمیزاد، مرۆڤ |
| ئەزمانزان | زمانزان |
| ئەزمانك | زمانە |
| ئەزۆكی | منۆكی |
| ئەزیەت | ئازار ، ئێش و دەرد |
| ئەز ئەزی | خۆپەرستی ، خۆویستی |
| ئەز خدام | من نۆكەرتم (بۆ ئافرەتان بەكاردێت) خزمەتكار بۆ رەگەزی مێ |
| ئەژدەر | ئەژدەها |
| ئەژدەها | ماری گەورەو زەبەللاح |
| ئەژمار | ژمارە |
| ئەژمارتن | ژماردن ، ئەژماردن ، هەژمارتن |
| ئەژمارتی | ژمێردراو |
| ئەسانسێر | قادرمەی كارەبایی |
| ئەسكەر | سەرباز |
| ئەشقی | یاخیبووی دەوڵەت |
| ئەشكەرە | ئەشكرا ، دیار ، خۆیا ، بەرچاڤ ، پەنی |
| ئەشكەرەبوون | ئاشكرابوون |
| ئەفراندی | داهێنراو ، دروستكراو |

| | |
|---|---|
| ئەفسی | هاوسێ، هەڤسی،جیران، دراوسێ |
| ئەڤڕەنگ | بەم شێوەیە |
| ئەڤڕۆ پاش | لەم ڕۆ بەدواوە |
| ئەڤڕۆ پێڤە | لەم ڕۆ بەدواوە |
| ئەڤشی | وشکبوو |
| ئەڤشین | وشکبوون |
| ئەڤین | دڵداری ، ئەوین ، خۆشەویستی |
| ئەڤیندار | دڵدار |
| ئەڤینڤان | دڵدار ، ئەویندار ، ئاشق |
| ئەگەر | لەوانەیە |
| ئەگەر | هۆکار ، فاکتەر |
| ئەلند | کازێوە ، بەری بەیان |
| ئەلهۆ | هەڵۆ |
| ئەلۆهـ | هەڵۆ |
| ئەلەکتریك | کارەبا |
| ئەلەمتریك | لایێتی دەستی |
| ئەم | ئێمە |
| ئەمێ | ئێمە ـ (ئەمێ بچین دهۆکێ) |
| ئەنتیکە | کەم وێنە، سەیر |
| ئەنتیکەخانە | مۆزەخانە |
| ئەنتیکەناس | کەونناس ، کۆنناس |
| ئەنیگرێ | رووگرژ ، نەعیم نەخۆش |

| | |
|---|---|
| ئەنیشك | ئانیشك |
| ئەنی | نێوچەوان |
| ئەنی | بەرە |
| ئەنیگەش | رووگەش |
| ئەنی ڤەبووی | رووگەش ، دەم بە خەندە |
| ئەهد | بەڵێن ، پەیمان |
| ئەهدكرن | بەڵێندان ، پەیماندان ، سۆزدان |
| ئەور | هەور |
| ئەوراندن | وررووژاندن |
| ئەورین | وررووژان |
| ئەیاغ | زۆر لاواز ، لاك |
| ئەینی | هەینی،جومعە |
| ئەینی | هێمن |
| ئەیوان | هەیوان |
| ئیدیەم | زاراوە |
| ئیدی | ئیتر |
| ئیرس | رووس ، عویرس |
| ئیرۆ | ئەمڕۆ |
| ئیزا | سزا |
| ئیزگەه | ئێزگە |
| ئیزنخاستن | مۆڵەت وەرگرتن |
| ئیساڵ | ئەم ساڵ |
| ئیسبات | بەڵگە ، دەلیل ، گرۆڤ |
| ئیسباتكرن | سەلماندن ، بەڵگەهێنان |

| | |
|---|---|
| ئیسك | نزگەرە |
| ئیشەڤ | ئەم شەو |
| ئیشی | هێشوو |
| ئیلەه | هەردەبێ ، پێویستە هەرببێ |
| ئیما | ئاماژە |
| ئیماژە | ئاماژە |
| ئینا | هێنای |
| ئینا | ئەوجا |
| ئینان | هێنایان |
| ئیناندن | بڕوانە : ئینان |
| ئینانەدەر | دەرهێنان،دەرنان |
| ئێخسیر | دیل ، ئەسیر |
| ئێدن | ئەویتر |
| ئێرش | هێرش ، پەلامار |
| ئێزا | ئەزیەت |
| ئێزنگ | داری سووتاندن |
| ئێسان | ئاسان |
| ئێش | دەرد ، ئازار |
| ئێشا زراڤ | سیل |
| ئێشدار | دەردەدار |
| ئێشیك | کەژاوە |
| ئێڤار | ئێوارە ، هێڤاری |
| ئێڤەلی | سەرسەری ، خوێڕی |
| ئێك | یەك |

| | |
|---|---|
| ئێکانه | نێره بەراز |
| ئێکانه | تاقانه |
| ئێکتەق | یەکسەر ، بەبەردەوامی ، لەسەریەك |
| ئێکجار | جارێك |
| ئێکجاری | بۆ هەتاهەتایە، بەتەواوی |
| ئێکخستن | یەکخستن |
| ئێکدل | تەبا ، یەکگرتوو |
| ئێکسان | یەکسان |
| ئێکسەر | راستەوخۆ |
| ئێکمال | ماڵێك |
| ئێکمال | تەبا ، دەستەبرا |
| ئێگجاری | بەجارێك ، بەتەواوی ، بۆ هەتا هەتا |
| ئێگجار | بەتەواوی |
| ئێگجار | جارێك |
| ئێل | خێل ، عیل |
| ئێلەك | سەرمەمك ، سوخمە |
| ئێلپەرێس | تایفەگەر |
| ئێلپەرێسی | تایفەگەری |
| ئێلچی | پۆستەچی ، نامەبەر ، تەتەر ، مفردی |
| ئێمانەت | راسپاردە |
| ئێمیش | میوەجات، وشەیەکی تورکییە |
| ئێورگەه | ئەوشوێنەی شەو تێیدا دەحەسێنەوە |
| ئێورین | نیشتەجێبوون ، ئاکنجیبوون |
| ئێورین | گیرسانەوە ، جێگیربوون |



| | |
|---|---|
| با | بەڵێ |
| با | هەوا |
| باب | باوك |
| بابا | بەڵێ |
| بابا | باوکە |
| بابکال | باب و باپیرە |
| بابەلێسك | جۆرە گوڵێکی بەهارییە |
| بابەلێسك | گێژەڵوکە، گەردەلوول |
| باب وکاڵ | باب و باپیر |
| باپەشك | گەردەلوول ، بابەلێسك |
| باپیر | باوە گەورە |
| باپێچ | گەردەلوول |
| بات | برا، کەك، کاك |
| باتیك | بات |
| باتی | بری ، جێگای ، شوێنی،جیاتی |
| باخ | باغ |
| باخل | باخەڵ |
| باخۆش | توانادار ، بەهێز |

| | |
|---|---|
| باخۆشی | تواناداری ، بەهێزی |
| بادان | سوڕاندن |
| بادمان | جۆرە عەیارێکە بۆ پێوان |
| بادەر | پێچەر |
| بادەك | دۆسیە |
| بادەك | لوولدەر |
| بادی | جام |
| بادینی | خەڵكی دەڤەری بادینان |
| بار | ئەوەی لەسەر پشتی بارەبەر دادەنێن |
| بار | بەش |
| بار | بوار |
| بار | دۆخ |
| باران | باران |
| باراندن | لەبەرزیەوە پرژاندن |
| باربەند | گوریس |
| باربێن | گوریس |
| باربەر | بارکێش ، بارهەڵگر |
| باربەر | ئارام ، دان بەخۆدا گر ، بارهەڵگر |
| باڕ | جوجکە کەوی بەهارە |
| باڕاندن | دەنگی مەڕو بزن |
| باڕك | جووجەڵەی کەوی بەهاران |
| بارکەفتی | بێچارە |
| بارکرن | بارکردنی بار لەولاغی بار هەڵگر |
| بارکرن | کۆچکردن |

| | |
|---|---|
| بارکرن | قورمیش کردنی کاتژمێر |
| بارکەفتن | بارکەوتن |
| بارگران | بار قورس |
| بارگران | ئەوەی زۆر غەم لە دونیا دەخوا |
| بارگیر | ئەسپی ناڕەسەن،ماهین |
| بارویت | بارووت |
| باڕوڤە | ڕەشەبا ، گەردەلوول |
| بارەبی | پیتاك ، بارەبۆ،کۆمەکی ماددی |
| بارەبیکرن | پیتاك کۆکردنەوە |
| بارین | هاتنە خوارەوەی بەفرو باران |
| باز | تەیری ڕاو |
| باز | هەنگاو، گاڤ ، شەقاو |
| بازدان | پەڕینەوە بە هەنگاو،هەڵاتن ، ڕاکردن ، غاردان |
| بازدان | تێپەڕین |
| بازدە | ڕاکە ، هەڵێ |
| بازڤیرك | گەردەلوول |
| بازك | بازوو ، باسك |
| بازنك | دەستبەند ، بازن ، بازنە |
| بازن | بازنە |
| بازەبەر | پردەباز ، بەردەباز |
| بازەبەر | بەردەباز |
| باژ | باج |
| باژاڕڤانی | شارستانی ، شارەوانی |
| باژاڕی | شارستانی |

| | |
|---|---|
| باژڤان | باج وەرگر |
| باژێڕی | شارنشین ، خەڵکی شار |
| باژێلە | ون ، نادیار ، گوم |
| باژێلەبوون | ونبوون ، بزربوون ، گومبوون |
| باژێڕڤانی | شارەوانی |
| باژێڕاتی | شارستانی |
| باژێڕی | شارستانی |
| باسک | دار جگەرە |
| باسک | گرد ، بەرزایی |
| باسک | لەجومگەی دەستەوە تا هانیشک |
| باسک | باڵ ، ڕەوت |
| باش | باشە ، بەڵێ ، چاکە |
| باش | بەڵێ |
| باشتر | چاکتر |
| باشترین | هەرەچاک ، چاکترین |
| باشقە | جیاواز ، لێکجیا |
| باشیکەر | چاکەکار |
| باشیکە | مەلێکی ڕاوکەری بچووکە، واشە |
| باشین | کاری چاکە |
| باڤ | مەیلەو ( ئەڤ نانە باڤ ڕەشە ) . |
| باڤ | باوک |
| باڤک | خێزان ، مالبات |
| باڤی | باوی ، بادام |
| باق | گورزە |

| | |
|---|---|
| باقۆڕك | ئەو بەرەی هێشتا بەتەواوی پێنەگەیشتبێ |
| باقۆفك | ئەو بەرەی هێشتا بەتەواوی پێنەگەیشتبێ |
| باقۆڕك | بەری قەزوانی هێشتا پێ نەگەیشتوو |
| باكرن | وەرمتن ، هەوكردن ، ئەستوور بوون |
| باكوزيرك | كرێوە، باوباران |
| باكوزيرك | بەفری بەباوە ، زريان |
| باگوردان | بانگێڕ ، باگردێن |
| باگوهۆڕك | هەوا گۆڕكێ ، دوو هەواكەوتن |
| باگەڕ | كرێوە |
| بال | جەم ، تەنيشت ، نك |
| بالاڤی | جلشۆ |
| بالاڤيك | ساواری ورد |
| بالا | قەد |
| بالافڕ | بەرز فڕ |
| بالاڤ | خۆشتن،گەرماو ، شوشتنی شمەك |
| باڵا | سەروو - (بەرواری باڵا، مزويری باڵا) |
| بالبەر | بەرگەگر |
| بالبەر | ئارامگر ، بە حەوسەڵە |
| بالكێش | سەرنج راكێش |
| بالگ | بالگە |
| بالويلك | بڕوانە باليلك |
| بالەتە | ميوەی تازە پێ گەيشتوو |
| بالەفڕ | فڕۆكە ، تەيارە |
| بالەفڕڤان | فڕۆكەوان ، شۆفێری فڕۆكە |

| | |
|---|---|
| باليك | بالوكه |
| باليلك | ئەو هەویرەی بۆ خواردن لەناو دۆشاو دەکولێنن |
| باليف | بالگه ، باليو ، سەرین |
| باليف | سەرین |
| بامشت | گەردەلوول |
| بان | سەرەوەی هەرشتێك ، تاقە سەر |
| باندەڤ | سڕ و سەرما |
| باندور | کاریگەری |
| بانگێڕ | باگوردان |
| بانگەر | ئەو بەردانەی لەسەر لێواری بانەکانی خانوو ریز دەکرێن بەمەبەستی رێگە گرتن لەهاتنی ئاو بۆ ناو خانوو . |
| بانگهەلدێران | بانگەواز کردن |
| بانی | دەشتی بەرز |
| باهر | بەش |
| باهوڕ | هوڕەبا ، رەشەبا |
| باهۆز | گەردەلوول |
| باهینك | سروە ، فێنکەبا ، بای فێنك |
| باهینك | بای فێنکەرەوە ، دڵخۆشی |
| باهیڤ | باوی ، بادام |
| باهیڤۆك | چواله ، باوی تەڕی تازە پێ گەیشتوو |
| باوڕ | باوەڕ ، بڕوا |
| باوەڕی | متمانە ، بیروباوەڕ |
| باوەشك | باوێشك |
| باوەشینك | باوەشێن، فێنککەرەوە |

| | |
|---|---|
| باوەشی | باوێشك |
| بئاڤ | تەڕ |
| ببەرڤە | بۆ پێشەوە |
| ببەرڤە | بەبەرەوە |
| ببەژن | بالاّ بەرز ، قەد بالاّ |
| بت | خوای دەستكرد ، بوت ، سەنەم |
| بچویك | بچووك ، گچكە |
| بچویك | مندالّ ، زارۆك |
| بچویكبوونەڤە | گچكەبوونەوە |
| بچویكینی | كاری مندالاّنە |
| بچویكینی | سەردەمی مندالّی |
| بحال | دووگیان ، زگپڕ ، ئاوس |
| بحەز | خۆویست |
| بختان | قسەی هەلّبەستە، بێ بەختی |
| بختانچی | قسە هەلّبەست،بوختانكەر،بێبەخت |
| بخۆڤە | بەقەلاّفەت ، گەورە و زەبەللاّح |
| بدل | رازی ، قایل ، بەدلّ |
| بدلبوون | ڕا لەسەر كارێك یا شتێك بوون |
| بدە | بمدەرێ ، بدە |
| بدەست | ئەنقەست |
| برازا | كوڕی برا |
| برازی | كچ یا كوڕی برا |
| براژتن | برژاندن |
| براشتن | برژاندن |

| | |
|---|---|
| براك | برا ، كاك ، براله |
| براماك | برای هەرلەدایك لەباوك نەء |
| براندن | تەواو كردن ، بەجێ نەهێشتن |
| براندن | قەلآچۆكردن |
| برایی | برایەتی |
| برچی | برسی |
| بڕ | گیاییێكی خۆشە لەگەڵ پەنیر تێكەڵ دەكرێت بۆ خواردن |
| بڕ | خێرا چوون |
| بڕ | جێگای پەڕینەوە لەئاوی رووبار |
| بڕ | بزاڤ ، جوولە |
| بڕانێ | یارییێكی غاردانە |
| بڕبوون | پەرتبوون ، لێكجیابوونەوە |
| بڕمیت | هاردی تووتن |
| بڕمیت | زۆر تیژ ، زۆرهار |
| بڕنۆ | جۆرە تڤەنگێكە |
| بڕەڤان | ناوبژیكەر ، بەڕەوانی |
| بڕەڤانی | ناوبژیكەری ، بەڕەوانی |
| بڕەك | بڕەڕ ، ئامێری بڕین،مشار |
| بڕین | قەتكردن |
| ب رۆژ | بە رۆژ |
| ب رۆژی | رۆژوو وان ، بە رۆژوو |
| بڕین | بریندارکردن |
| بڕین | هەنگاوێك بۆ پێشەوە چوون |
| بڕینگە | شوێنی بڕینی دار |

| | |
|---|---|
| بڕێن | جۆش هاتنی ئاوی کولاّو |
| بڕیتك | مشاری گەورەی دووکەسی |
| بڕێژ | بە پیت و فەڕ |
| بڕی | قڕقێنە ، قرب |
| بڕی | لەتیکرد |
| برسقین | تروسکان ، درەوشانەوە |
| برغی | برغو |
| برك | حەوز ، گۆمی دەستکرد ، برێم |
| برن | بردن |
| برنجی | هەرەباش ، پلەیەك ، وشەیەکی تورکییە |
| برنەڤە | سەرکەوتن ، بردنەوە |
| برھ | برwو |
| برهاندن | نەهێشتن ، کۆتایی پێهێنان |
| برهە | برۆ |
| بروی | برژانگ |
| برۆ | ئەبرۆ |
| برووسی | بڕوانە : بریسی |
| بریانی | جۆرە خواردنێکە |
| بریان | تەواو بوون |
| بریا | تەواوبوو |
| بریسی | برووسکەی ئاسمان |
| بریسی | تەزووی بەژان |
| بریسکە | بروسکە ، برقی |
| برین | زام |

| | |
|---|---|
| برێم | گۆماوی ئاو |
| بری | بردوو |
| بری | برووو |
| بریَ | برا |
| بریَ | خستنه ناوی |
| بزاغ | چوست ، چالاك |
| بزاڤ | هەوڵدان ،خەبات ،جولآنەوە |
| بزان | دانا ، زانا |
| بزان | بزانه |
| بزاندن | حەپەساندن ، ترساندن ، تۆقاندن،فەتساندن |
| بزاندن | پساندن ، پچڕاندن |
| بزدان | ترسان ، تۆقاندن |
| بزدینۆك | ترسێنەر ، بڤە |
| بزدیان | پچڕان |
| بزدیان | حەپەسان ، تۆقان ،ترسان |
| بزڤاندن | جووڵاندن ، لڤاندن ، تەکاندان |
| بزمارۆك | قەتماغەی برین |
| بزمك | دارو پەتێکە دەخرێتە دەمی بەچکەی ئاژەڵی مێ بۆ ئەوەی شیر نەمژێت |
| بزووت | مەشخەڵ |
| بزۆت | بزوتك |
| بژار | هەڵبژێردراو |
| بژار | بژارەکردنی دەغڵ و دان لەگیای بێ کەڵك،ئادە |
| بژار | ژەهردار |
| بژارتن | هەڵبژاردن |

بژارکرن خاوێنکردنی دەغڵ و دان لەگیای بێ کەڵك

بژارە کاری خاوێنکردنی دەغڵ ودان لە گیای بێ کەڵك، ئادە

بژارە هەڵبژێردراو، هەڵاوێردە ، هەڵبژاردە ، دەگمەن

بژارت خاوێنیکردەوە،جیاکردەوە

بژارتن جیاکردنەوە ، پۆلێنکردن

بژالە پەرێشان

بژالە پەرت و بڵاو

بژانك برژانگ

بژاندن گشتاندن

بژارتی هەڵبژێردراو

بژڤان خاوەن بەڵێن

بژکین پارچە پارچە بوون

بژلی بێجگە

بژن خێزاندار ، بەژن

بژوژن سوژن

بژوون پاك ، خاوێن

بژوین خاوێن ، پاك

بژیان پژان

بژیان جیابوونەوە ، پەرت و بڵاو بوون

بژیلانك برژانگ

بژین هەر بمێنن

بژین گوڵێکی بۆنخۆشە

بژی هەر بمێنی، هەرساخبی، زیندوو بی

بژی توایەوە،بهشت،بهژی

| | |
|---|---|
| بست | مەودای نێوان کۆتایی پەنجەی قلینچك و گەورە ، بس |
| بست | بستەی ئاسن |
| بستادلی | ژێی هەستیار |
| بستە | رام ، کەهی ، کەوی |
| بستە | زیرەك و ژیر ، چاونەترس |
| بستین | بڕوانە : بستینە |
| بستینە | وەربگرەوە،لێوەرگرە |
| بستیك | لاسك |
| بستیك | ساق ، قەد |
| بستی | ئەوشوێنەی هاتووچووی تێدا دەکرێت لەشاخە سەختەکاندا |
| بسك | مووی سەر لاجانك ، زولف |
| بسلمان | موسڵمان،پەیڕەوانی ئایینی ئیسلام |
| بسەکنە | راوەستە ، مەچوو،مەڕۆ |
| بشافتن | هەڵپشاوتن |
| بشافتن | شیکردنەوە |
| بشکفتن | پشکوتن |
| بشکوڕین | گەشانەوە ، بزەی لێو ، خەندە |
| بشکوژ | خونچە غونچە ، سۆلین |
| بشکۆژ | دوگمەی کراس |
| بشکۆفك | غونچە |
| بشی | لانە ، جەنگەل ، دارستان |
| بفدانك | دەبدەبە،پەمپفۆك |
| بڤر | تەوری دار بڕین |
| بڤشۆ | کەڕوو، کیفکی |

| | |
|---|---|
| بڤشۆبوون | کەڕوو بوون، کیفکیبوون |
| بڤە | مەترسی ، خەتەر |
| بڤێ | بییەوێ |
| ب ڤێ | بەمە |
| بڤێ نەڤێ | بیەوێ نەیەوێ |
| بکوژ | کوشندە ، کوژەك |
| بگیان | قەڵەو ، بەگۆشت |
| بگیان | گیاندار |
| بلا | باشە |
| بلا | با |
| بلاڤ | بلاو ، پەڕاکەندە |
| بلانگە | بالیف |
| بلانێ | با وابێ |
| بلبل | بولبول |
| بلغەم | بەڵغەم |
| بلق | بڵقی ئاو ، پەقیشك |
| بلندبێژ | بلندگۆ، دەنگ بەرز |
| بلنگاز | هەژار |
| بلوور | بلوێر |
| بلویر | بلوێر |
| بلۆر | بلۆرینە |
| بلۆر | چرا |
| بلۆش | بێجگە ، بژلی |
| بلەز | بەپەلە ، خێرا ، لەزگین |

| | |
|---|---|
| بلەمانێ | هەروەك دەڵێن |
| بلەیزە | گەمە بکە |
| بلی | بێجگە |
| بم | کوندەبەبوو |
| بن | ژێر ، خوار |
| بن | بنەوە |
| بن | کۆتایی |
| بنارە | شەڕە قسە |
| بناس | هۆکار ، فاکتەر ، سەدەم ، ئەگەر |
| بناسکار | تاوانبار ، تۆمەتبار |
| بناغە | بنێشە ، شەنگەستە ،هیم |
| بناغ | بناغە ، هیم |
| بناڤ | خاوەن ناو ، بەناو |
| بناڤ | ناودار ، بەناوبانگ |
| بناڤێککەفتن | تێکبەر بوون |
| بنئەرد | ژێر زەمین |
| بنئەمر | ژێردەست ، فەرمانبەر |
| بنئەمری | ژێردەستی ، فەرمانبەری ، بێدەستەلآتی |
| بنبار | غەمخۆر |
| بنبار | لەژێر بار |
| بنپاخڵ | بنباخەڵ |
| بنپەل | ژێر ئاگر |
| بنپێ | ژێرپێ ، پێشێڵ ، پێپەست |
| بنتڕاش | بەلاش ، بێ بەرامبەر ـ بەکەسێك دەگوترێت کەهیچ بەهاو ڕێزێك بۆ |

دانەنرێت

| | |
|---|---|
| بنتل | خوارەوەی زگ ، بنزگ ، ژێر زگ |
| بنتۆڤ | بنەتۆ |
| بنجوی | بەرەچەڵەك جوولەكە |
| بنچەل | بناری شاخ |
| بنحەرام | زۆڵ ، بیژی ، حەرامزادە |
| بندار | ژێردار |
| بندریان | دەفرێك یان هەرشتێك كەهەرگیزاو هەرگیز پڕ نەبێت |
| بندك | ژێر پیاڵە |
| بندەست | ژێردەستە |
| بنزك | بڕوانە بنتل |
| بنستر | رێنمایی ، بنەما |
| بنعەرد | ژێر زەمین |
| بنفلەھ | فەلەی تازە موسلمان بوو ، بەرەچەڵەك فەلە |
| بنڤەكۆل | پیلانگێڕ |
| بنڤەكی | نهێنی ، داپۆشی |
| بنڤە | بنو ، بخەوە (فرمانی داخواز ییە) ، بڕازێ |
| بنڤە بنڤە | بەنهێنی |
| بنڤەكۆل | ئەوكەسەی كاری كۆڵان دەكات |
| بنڤەكۆلین | بڕوانە بنڤە كولاّن |
| بنڤەكولان | پیلانگێڕی ، لەبنكۆڵان |
| بنڤێشە | بناغە |
| بنك | بنكە |
| بنكار | رەگ |

| | |
|---|---|
| بنكدار | هەرشتێك كە بنی هەبێ ، خاوەن پێگە |
| بنكڤەچوون | چوونەكنی ، چوونەلای |
| بنكلاندن | كۆلین |
| بنكۆل | بڕۆانە : بنڤەكۆل |
| بنكۆلین | بڕوانە : بنڤە كولان |
| بنكەڤیك | گوڵە نەورۆزە |
| بنكەفتن | ژێركەوتن ، دۆڕان |
| بنكەفش | ژێرقۆڵ ، بن چنگل |
| بنگۆڤ | گەلەخان ، حەوشەی مەڕو ماڵات |
| بنگۆڤ | شوێنی حەسانەوەی مەڕوماڵات |
| بنگەھ | بناغە |
| بنگەھ | بنكە ، رێسە |
| بنگەھی | بنجی |
| بنگەهین | بنەڕەتی ، شەنگستی |
| بنستر | قادرمە ، پەیژە ، سترە |
| بنملانێ | زۆرانبازی |
| بنواشە | بناغە ، بنمیچە |
| بنەتار | بنێشە ، بناغە |
| بنەجھ | نیشتەجێ،ئاكنجی |
| بنەجھ | نەگۆڕ ، سەقامگیر ، تەواو |
| بنەجی | جێگیر ، نیشتەجێ |
| بنەجێبوون | نیشتە جێبوون |
| بنەحەق | بەناحەق ، بەناڕەوا |
| بنەدار | خانەدار |

| | |
|---|---|
| بنەدار | بنی دار |
| بنەفشی | وەنەوشەیی |
| بنەڤان | بنەوان |
| بنەکۆك | بڕوانە بنەتار |
| بنەماڵ | بنەماڵە |
| بنەمال | خێزان ، بەرەباب |
| بنەواشە | بنەما ، پرەنسیپ |
| بنیاتفلەھ | بندیان |
| بنیات | بناغە ، بنەڕەت |
| بنیات | بنەما |
| بنێڕ | بڕوانە ، تەماشاکە |
| بنێشە | بناغە ، بنجی |
| بن چنگانێ | زۆرانبازی |
| بهارتن | رابواردن |
| بهشتن | توانەوە ، بهوژین |
| بهن | پشوو |
| بهن | بۆن |
| بهنژین | پژمین |
| بهنژین | پژمین |
| بهنۆك | فاریزە ، کۆما |
| بهن تەنگ | بێ ئارام ، بێ حەوسەلە |
| بهۆرتن | رابواردن |
| بهۆست | بستی دەست |
| بهۆست | بستی ئاسن |

| | |
|---|---|
| بهەشت | بەهەشت |
| بهیستن | گوێ لێبوون ، بیستن |
| بهیساندن | پێڕاگەیاندن |
| بهێندان | پشوودان ، حەسانەوە |
| بهێل | واز بێنە |
| بهێن | بۆن |
| بهێن | حەسانەوە |
| بهێن تەنگ | بێ حەوسەڵە ، بێ تەحەمول |
| بهێنڤەدان | پشوودان ، بێندان |
| بهی | بەهێ ، بێ |
| بوت | خوای دەستکرد، سەنەم |
| ب وج | بەکەڵك |
| بوسورمان | موسوڵمان |
| بوها | نرخ ، بەها |
| بوهاتن | توانەوە |
| بوهار | بەهار ، بهار |
| بوهرین | بەخشین ، بۆرین |
| بوهست | شیربست |
| بوون | لەدایك بوون ، پەیدا بوون |
| بوویەر | قەومین ، رووداو |
| بۆت | ئاوبارە |
| بۆت | پلۆسك |
| بۆت | بۆڕی لەدار دروستکراو |
| بۆتك | بووت |

| | |
|---|---|
| بۆر | قورپانی |
| بۆر | ئەستوور |
| بۆڕ | ڕێژیار |
| بۆڕ | چڕی گژوگیا |
| بۆڕ | دەنگی گڕ و ئەستوور ، پێچەوانەی ناسك و تەڕ |
| بۆڕی | بۆڕیە |
| بۆڕ | گیا و خۆراکی پێگەیشتوو وبەرز وچڕ |
| بۆڕ | شوێنی پەڕینەوە لە رووبار |
| بۆڕ | بوار ، دەراو |
| بۆرین | بەخشین ، عەفوکردن |
| بۆرین | تێپەڕین |
| بۆری | تێپەڕی ، دەربازبوو |
| بۆری | بەخشی ، عەفویکرد |
| بۆز | شینی ئامال سپی |
| بۆز | سپیەکی کراوە مەیلەو شین |
| بۆست | بست |
| بۆسیبوون | بۆنی سووتان لێهاتن ، هەر خوارکێك بە هۆی سووتانە تامو چێژی گۆڕانی بەسەر دا بێت. |
| بۆسی | تام و بۆی ئەو ماستەی شیرەکەی زیاد لە پێویست کوڵێنرابێ . |
| بۆش | فرەزۆر ، فراوان |
| بۆشك | ژاك |
| بۆشاتی | جەنجاڵی ، قەرەباڵغی |
| بۆشی | قەڵەباڵغی ، فرەیی |
| بۆفرین | توانەوە |

| | |
|---|---|
| بۆفراندن | تواندنەوە |
| بۆناچی | لەبەرچی |
| بۆناچی | بۆناڕۆیی |
| بۆنەڕیپ | گرفتار بوون |
| بەبیك | مندالّی ساوا ، بچكۆلە |
| بەتال | بێ كار |
| بەتال | بەتالّ ، بێ ناوەڕۆك ، خالّی ، ڤالا |
| بەتالی | بێ كاری |
| بەتالّی | ڤالایی |
| بەترمە | هەلّپەرتاوتن |
| بەترپێر | سێ رۆژ بەر لە ئەمڕۆ |
| بەترپێرار | سێ سالّ پێش ئێستا |
| بەتلاندن | خراپكردن |
| بەتلی | ماندوو ، شەكەت |
| بەتلین | ماندوو بوون |
| بەتلین | لەكاركەوتن ، شەكەتبوون |
| بەتەن | پەسار |
| بەتەنی | پەتۆ ، بە تانیە |
| بەتەن | بەری ناوەوەی جل و بەرگ |
| بەتەر | بەتران |
| بەتیك | جۆرێكە لە پەچە |
| بەحجین | ترسان ، فەتسین |
| بەحەشت | بەهەشت |
| بەخت | شانس ، چانس |

| | |
|---|---|
| بەخت خاستن | داوای پەنادان کردن |
| بەخت دان | پەنادان، پێدانی بەڵێی پاراستن |
| بەخشیش | بەخشش ، دیاری ، خەڵات |
| بەخشین | بۆرین،عەفوکردن |
| بەخیل | رژد ، چروك ، خنس |
| بەدەن | لەش ، لاشە ، کەلەش |
| بەدەل | لەجیاتی ، لەبری |
| بەدەلڤەکرن | قەرەبوو کردنەوە ، تۆڵەکردنەوە ، بەوەرنانەڤە |
| بەر | بەرد |
| بەر | داهاتی میوەو بیستان |
| بەر | لای پێشەوە |
| بەر | ئەندازەو رادە |
| بەر | لا ، ڕەخ |
| بەر | بەش ، پار |
| بەر | تۆل ، بەرگرتنی ئاژەڵی مێ |
| بەراز | خووگ |
| بەرازە | کاریتە |
| بەراڤ | زەوی بەراو |
| بەراش | بەردئاش |
| بەرامبەر | یەکسان ، وەکیەك ، بەرانبەر |
| بەران | بەران |
| بەرانبەر | بەرابەر ، یەکسان ، وەکیەك |
| بەراهی | پێشەکی ، سەرەتا |
| بەرایی | پێشەکی ، سەرەتایی، دەستپێك |

| | |
|---|---|
| بەرازە | دارێکی ئەستوورە دەخرێتە ژێر بنمێچەی خانوو |
| بەرات | بەڵگە |
| بەراپشت | ئاوەژوو |
| بەران | قامکی گەورە |
| بەران | مەڕی نێر |
| بەرئینان | وەبەرهێنان |
| بەربا | روو لە با |
| بەرباچوو | لەکیس چوو ، بەفیڕۆچوو |
| بەربانگ | کاتی رۆژووشکاندن بەرلەبانگدان |
| بەربژار | کاندید ، هەڵبژاردنی کەسێك بۆ وەرگرتنی پۆستێك ، پاڵێوراو |
| بەربەست | لەمپەر ، کۆسپە ، رێگر ،ئاستەنگ |
| بەربوون | ئازادبوون ، رزگاربوون |
| بەربوون | بەرەڵلا بوون |
| بەربوون | سەرلەنوێ هاتن ، وەکووخوێن وئاو |
| بەربوونەڤە | کەوتنە خوارەوە |
| بەربویك | بەربووك |
| بەربژاری | پاڵێوراوی |
| بەربەژن | نووشتە |
| بەربێژ | چەنەباز ، پڕبێژ |
| بەربهێر | نەرم و نیان |
| بەربا | روو لە با |
| بەربانگ | بانێژە ، بەرسڤك |
| بەربەند | قەدەغە ، بەربەست |
| بەربەر | سەرتاش |

| | |
|---|---|
| بەربەری | سەرتاشی |
| بەربهەڤ | بەرامبەر یەك ، هەڤبەر |
| بەربهێر | ئارامگر |
| بەربهێری | ئارامگری |
| بەرپان | بەربەرین |
| بەرپالك | پاڵهێز |
| بەرپرس | لێپرسراو ، کاربەدەست |
| بەرپشت | قوماشێکە لەسەر پشتی رەشە ولاّغ دادەنرێت |
| بەرپێك | پێخوست ، ژێرپێدراو |
| بەرپەزی | لەوەڕاندنی مەڕومالاّت ، شوانی |
| بەرپەڕ | لاپەڕە |
| بەرتاڤ | بەرهەتاو |
| بەرتڤك | بەردی هاوێژتن |
| بەرتەسك | باریك ، تەنگ ، نازك |
| بەرتەلاش | گەورە و زەبەلاح |
| بەرتەنگ | تەنگەبەر ، نازك |
| بەرتەنگ | تەسك ، بارودۆخی ژوار |
| بەرتیل | رشوەت ، واسیتەکردن بەپارە بۆ جێبەجێکردنی کارێك |
| بەرتەحل | بەرتاڵ |
| بەرتر | پێشتر |
| بەرتراش | وەستای بەرد ، بەرد تراش |
| بەرجلك | بەروانکەی منداڵ |
| بەرجل | بەروانکە ، بەروانە |
| بەرجۆمك | کرکراگە |

| | |
|---|---|
| بەرجەزا | تاوانبار ، سووچکار |
| بەرجەزابوون | تاوانبار بوون |
| بەرجەزاکرن | سزادان |
| بەرچێلك | گەدە |
| بەرچقین | فلیقان |
| بەرچقاندن | فلیقاندن |
| بەرچاڤك | چاویلکە |
| بەرچاڤ | دیار ، بەرجەستە ، بەرچاو،خۆیا،عەیان |
| بەرچاڤ تەنگ | رژد ، بەخیلێ ، رەزیل |
| بەرچاڤتێر | مەردانە ، سەخی |
| بەرچن | قەرتالەی میوەچنی ، ئەوەی بەر لیێ دەکاتەوە |
| بەرچەل | بناری چیا |
| بەرحەلینك | کورەی تواندنەوەی بەرد و رەساس |
| بەرخوەر | ئەو شتانەی بەریان دەخورێت |
| بەرخار | لار ، کەچ |
| بەرخڤان | شوانی بەرخان |
| بەرخدار | خاوەن بەرخ |
| بەرخەڤ | لەکاتی نوستندا |
| بەرخۆر | بەرهەم خۆر ، رەنجبەر ، داگیرکەر |
| بەردەفیك | ناحەز ، دوژمن |
| بەردرپیایی | فراوان |
| بەردلك | خۆشەویست ، یار |
| بەردایی | ئازاد ، بەرەللاّ |
| بەردەڤك | گزیر ، قسەبێژی موختاری گوند |

| | |
|---|---|
| بەردەستکرن | خستنە ژێر دەست ، کۆنترۆڵ کردن |
| بەردەستبوون | لەبەردەست |
| بەردان | بەرگرتن |
| بەردان | بەرەڵلاکردن ،تەلاقدان |
| بەردانەڤە | فڕەدانە خوار |
| بەردل | خۆشەویست ، ئازیز |
| بەردڵی کەفتن | لەپێش چاو رەشبوون ، لەبەر دڵ کەوتن |
| بەردەڤك | قسەکەری ئاغا و کوێخا ، گۆتەبێژ |
| بەردەستك | نۆکەر ، بەردەست ، خوڵام |
| بەردار | بە پیت و فەڕ ، بەرهەمدار |
| بەردەست | ئامادە |
| بەر روحدا | گیانەللا ، لەسەرەمەرگدا ، هەڤزنگ |
| بەر ڕەشبوون | لەبەرچاو کەوتن |
| بەڕ | بەڕە |
| بەڕووی | بیابان ، چۆلستان ، چۆڵەوانی |
| بەڕووی | بەڕوو |
| بەڕی | بیابان ، چۆڵستان |
| بەڕی | بەڕوو |
| بەڕیستان | چۆڵستان،بیابیان |
| بەڕەڤان | بەرگریکار ، بەرگریکەر |
| بەڕەڤان | ناو بژیکەر ، ناوبژیوان |
| بەرزەبوو | سەرگەردان،گومڕا،رێبەرزە |
| بەرزە | بزر ، گوم ، نادیار |
| بەرژێر | بەرەو خوارەوە ، لێژی |

| | |
|---|---|
| بەرسڤ | وەڵام،وەرام |
| بەرسڤك | هەیوان |
| بەرسنگ | یەخە ، پێشەوەی سینگ ، بەنچێلك |
| بەرسنگ | رێگەلێگرتن و بەرامبەر وەستان |
| بەرسۆز | سوکە نزگەرە |
| بەرسۆڤ | وەرگەڕاو ، قەلپبووی |
| بەرسۆژ | سینگ سووتانەوە ، سووتانەوەی سینگ |
| بەرشیڤ | خواردنی پێش جەمی شەو |
| بەرشیر | منداڵی شیرەخۆرە |
| بەرف | بەفر |
| بەرفرە | پان و بەرین ، گوشاد |
| بەرفرەیی | ئەرزانی |
| بەرفری | بەفرماڵ ، بەفریك |
| بەرڤاژی | بەپێچەوانە |
| بەرڤەڕا | بەلای پێشەوەدا |
| بەرڤەدێر | پارێزەر |
| بەرڤەهاتن | بۆکن هاتن ، بۆلای هاتن ، پێشوازی کردن |
| بەرڤەبەشین | بەشکردنی بەروبووم |
| بەرقام | رێگەساز |
| بەرکاز | پەنجەرەی بچووکی خانوو |
| بەرکانێ | گەمەی بەردانێ |
| بەرکۆش | دامێنی کراس کاتێ بەهۆی کارەوە بەرز دەکرێتەوە |
| بەرکرن | پۆشین |
| بەرکەتی | هەڵکەوتە ، شیاو ، لێهاتوو ، ژێهاتی |

| | |
|---|---|
| بەرکەفتی | هەڵکەوتە ، شایستە |
| بەرکەندال | رووڵەخۆر |
| بەرکەندال | ناجێگیر ، ناسەقامگیر |
| بەرکەندالی | ناسەقامگیری |
| بەرکێلەك | ئامێز ، باغەڵ |
| بەرگەڕیان | کۆشش ، هەوڵ |
| بەرگەڕان | بەدواداچوون |
| بەرگەه | رووگەه |
| بەرگویز | رانك و چۆغەل |
| بەرلاستیك | بەردەقانی |
| بەرما | بەماوە |
| بەرمل | باوەش |
| بەرمان | پاشماوە |
| بەرماڵ | دووگورد |
| بەرمالك | کابانی |
| بەرمایی | ئەوەی لەبەری مایەوە ، جێماو |
| بەرمای | مایتێکەری ، دەست تێوەردان |
| بەرمنەت | منەتبار |
| بەرمایك | پاشماوە |
| بەرناڤ | ناز ناو |
| بەرناس | ئەوەی خەڵك زوو دەناسێتەوە ، خەڵك ناس |
| بەرنیاس | بەرناس |
| بەرنگار | بەرهەڵستکار |
| بەرناڤ | راناو ، جێناو |

| | |
|---|---|
| بەرنڤێژ | پێش نوێژ |
| بەرهنگار | بەرهەڵستکار |
| بەرهەمگر | پاوانکار ، قۆرغکار |
| بەرهەڤ | ئامادە ، ساز |
| بەرهەڵست | دوژمن ، نەیار ، ناحەز |
| بەرهەم | بەرووبووم ، سامان |
| بەرهۆستا | شاگرد ، ئەوەی لەبەر دەستی وەستا ئیش دەکات |
| بەرهاڤێتن | بەردهاوێژی ، فڕێدانی بەرد |
| بەرهاڤێتن | لەبار چوون |
| بەرهاڤێتی | لەبار چوو |
| بەرهەڤ | بەراورد |
| بەرهەڤ | ئامادە |
| بەرهەڤکرن | ئامادەکردن |
| بەرهەڤکرن | بەراوردکردن |
| بەروپشت | ئاوەژوو |
| بەروەخت | پێش وەختە |
| بەروار | رێکەفت |
| بەروپشت | بەراوەژو ، پێچەوانە |
| بەروڤاژی | بەپێچەوانە |
| بەرۆك | یەخە |
| بەرۆکبەردان | وازهێنانی کەسێ لە کەسێکی تر |
| بەرۆکگرتن | بریتیە لە شەڕ فرۆشتن بە یەکێك |
| بەڕۆژ | بەرەو خۆر، ئەو شوێنەی کە رووی لە خۆرە |
| بەرۆژك | بەرۆژ، ئەو شوێنەی کە رووی لە خۆرە |

| | |
|---|---|
| بەڕۆژی | هۆزێکە لە دەڤەری بارزان |
| بەرۆك | یەخە ، بەرسینگ |
| بەرۆك | بەئاراستەی پێشەوە هەنگاونان |
| بەرە ژەنگ | نیشانە |
| بەرە دیفك | دوژمن ، ناحەز ، نەیار |
| بەرەبەیتك | بەیتی درێژ |
| بەرەڤاژی | پێچەوانە |
| بەرەباب | بنەماڵە |
| بەرەبەرە | هێواش هێواش ، پەیتا پەیتا |
| بەرەژۆر | روەو بەرزایی ، هەورازی |
| بەرەژێر | نشێو ، بەرەونزمایی |
| بەرەستێ | بەردی ئاگرپژێن |
| بەرەڤخێر | بەرەو چاکبوونەوەو باشبوونەوە |
| بەرەژێر | بڕوانە (بەرژێر) |
| بەرەڕەژووی | خەڵووز،بەردی خەڵووز |
| بەرەڤان | جووڵان |
| بەریك | گیرفان |
| بەرێخودان | تەماشاکردن |
| بەرێککەفتن | سەربەسەر ، بەرێکخستن |
| بەرین | پان و فراوان |
| بەرینی | بەرینایی ، پانی |
| بەریك | گیرفان |
| بەرێڤەبوون | ئاودیو بوون |
| بەرینها | بەرلەئێستا |

| | |
|---|---|
| بەرێڤەکرن | قوتدان ،ئاودیوکردن |
| بەریکڤال | گیرفان خاڵی ، بێ پول |
| بەرێکڤەهاتن | بەئەنجام گەیشتن |
| بەری | پێش |
| بەری | فراوان |
| بەری | بەر لە ئێستا |
| بەرێ | پێشان |
| بەری | بێ تاوان |
| بەر زیڤك | بەردی باریك |
| بەر ب | بەرەو |
| بەرێ کوژی | بەردی گۆشە |
| بەز | قەڵەوی ، چەوری |
| بەزاندن | غاراندنی رەشەولاغ ، تەی کردن |
| بەزر | گوم ، نادیار ، بزر ، وندا |
| بەزگەه | گۆرەپانی یاری |
| بەزل | رکابەر |
| بەزوغار | غاردان |
| بەزین | غاردان ، راکردن |
| بەزی | بەخێرایی رۆیشت ، غاریدا |
| بەژ | بیابان ، چۆلستان |
| بەژن | قەد و باڵا |
| بەژن بست | کورتە باڵا |
| بەژن زراڤ | قەدباریك |
| بەژن کورت | کورتە باڵا |

| | |
|---|---|
| بەژن بلند | بەژن درێژ |
| بەس | بەسە، چیترنا |
| بەساتی | کیفایەت ، بەسبوون |
| بەست | قەراخ چەمی بە بەردوچەو |
| بەست | گرێدا ، بەستەوە |
| بەستن | شەتەکدان ، بەستنەوە |
| بەستن | سەهۆڵ کردن |
| بەستی | توندکراو ، سەهۆڵ ، جەمدی |
| بەسکرن | دەست لێهەڵگرتن |
| بەش | پار، پشك |
| بەش | کراوە ، ئاواڵە |
| بەش | ئاژەڵی نێوچەوان سپی |
| بەشارکانێ | چاوشارکێ ، گەمەی منداڵانە |
| بەعجان | ترسان |
| بەعجاندن | ترساندن |
| بەعجین | ترسان |
| بەعیڤ | باوی ، باهیڤ |
| بەعیڤ تەڕ | چوالەباوی |
| بەعی | ئەو پارەیەی لە بری کڕینی شتێك پێشوەخت دەدرێت بە فرۆشیار |
| بەغیل | چاوچنۆك ، حەسود |
| بەفرمالك | بەفرماڵ |
| بەڤل | یەکانە ، تاقانە |
| بەڤل | هاوتا |
| بەڤل | کەپۆ،دفن ، لووت |

| | |
|---|---|
| بەڤل | دژ |
| بەق | بۆق |
| بەكرۆك | دوو زمان ، قسەبەر بۆ نێوان تێكدان ، بەكرۆك نیشانەی خراپییە |
| بەكرۆكی | دوو زمانی ، قسەبردن بۆ نێوان تێكدان |
| بەگلەر | پادشا ، بەگ |
| بەلاچیڤانۆك | بڕوانە : بەلاتینك |
| بەلاڤ | بڵاو ، پەرت |
| بەلالیزك | گوڵێكی بەهاری جوانە |
| بەلا | دەردو ناخۆشی ، موسیبەت |
| بەڵا | موسیبەت ، ڕووداوی ناخۆش |
| بەلاتینك | پەپوولە ، پەروانە |
| بەلاش | بەخۆڕایی ، بێ بەرابەر |
| بەلاڤ | بڵاو ، پەڕاگەندە |
| بەڵاڤۆك | بڵاوكراوە ، وەشان |
| بەلاتیتك | پەروانە ، پەپوولە |
| بەلاڤۆكخانە | خانەی بڵاوكردنەوەی كتێب |
| بەلاڤە | پەڕاگەندە |
| بەلاڤە | بڵاو |
| بەلاڤخانە | خانەی بڵاوكردنەوە |
| بەلاڤنامە | پەخشنامە |
| بەلافرۆتن | شەڕ فرۆشتن |
| بەلانس | هاوسەنگی |
| بەلبەلیتانك | پەپوولە |
| بەلبوون | دەرپەڕین |

| | |
|---|---|
| بەلخاندن | ورد و خاشکردن |
| بەڵکو | بەلکی ، مەبادا |
| بەلکی | بەڵکو ، بەلکە ، بەشکەم |
| بەلگ | پەڕەی دار و گوڵ ، گەڵا |
| بەلۆ بەلۆ | وامی ، شەپرزە ، شێواو |
| بەلەفش | ئاڵۆز ، قسەی ناتەواو نابەجێ |
| بەلەك | رەش و سپی |
| بەلەك | پووز ، گۆشتی نێوان ئەژنۆ و پێ لە دواوە . |
| بەلەم | قایغی گچکە |
| بەلەم | دەفری تێکردنی برنج |
| بەلەنگاز | هەژار ، بێچارە ، نەدار |
| بەلەنگازانە | هەژارانە |
| بەلەد | شارەزا ، رێناس |
| بەلەڤاژی | پێچەوانە |
| بەڵ | لوول . شتێ کە رەق و رەپ بێت . |
| بەڵ | دەرپەڕیو ، شۆڕە وەبوو |
| بەن | پەت |
| بەن | دارقەزوان |
| بەن | ببەن |
| بەنچێلك | یەخە |
| بەند | هەڵبەست ، هۆنراوە ، سروود |
| بەند | بەندە |
| بەند | چاوەڕوانی |
| بەندك | پەت |

| | |
|---|---|
| لویچ | لووس |
| لویس | لووس ، حلوی |
| لویس بوون | لووسبوون |
| لویسی | تەڕ زمانی ، زمان لووسی |
| لویشە | گیای لۆشە |
| لویلاق | لوولاق |
| لویلدان | لوولدان |
| لویل | لوول |
| لویلدان | لوولدان ، پێچان |
| لویلی | لوولەك |
| لۆپ | بەرگی ئەستوور |
| لۆپك | لۆبیا |
| لۆپك | لۆبیای سەوز |
| لۆت | لەرزین بەهۆی ترس و دەنگەوە |
| لۆتك | هەڵپەڕین لە خۆشیاندا |
| لۆتك هەلاڤێتن | هەڵپەڕین و سەماكردن لەخۆشیان |
| لۆتك | بەجووتە غاردان |
| لۆتیاتی | كاری لۆتی |
| لۆتی | كەسی بێ شەرم و حەیا |
| لۆت لۆتی | زۆر بەجموجۆڵ و بزێو |
| لۆخ | توانەوەی بەفر بەهۆی گەرما یا خود باران كەلەم رێگەیەوە ئاو زۆر دەبێت |
| لۆراندن | لایلایەی دایك بۆ منداڵ |
| لۆراندن | دەنگی درێژی سەك و گورگ |
| لۆرت | زۆر دەوڵەمەند ، سەرمایەدار |

| | |
|---|---|
| لۆرد | لۆرت |
| لۆری | کاری لۆراندن |
| لۆری | ئوتومبێلی گەورەی بار |
| لۆری لۆری | لایە لایە |
| لۆش | ئەونانەی هەویرەکەی ترش نەبووە |
| لۆکە | پەمۆ |
| لۆم | سەرکۆنە ، سەرزەنشت |
| لۆما | چونکە ، لەبەرئەوە |
| لۆمە | لۆم ، سەرکۆنە |
| لۆمەکرن | سەرزەنشتکردن |
| لۆمەیی | لۆمەکردن |
| لەب | بەری دەست |
| لەبتین | جولآن ، تەکان |
| لەبتاندن | جولآندن ، تەکاندان |
| لەبتین | جولآن ، لڤین |
| لەبلەبان | زمان درێژ ، پڕبێژ ، زۆر بێژ ، درێژدادڕ |
| لەبلەبك | زمان |
| لەبلەبۆك | زمان |
| لەبێ | بەڵێ |
| لەپ | بەری دەست–(هەتا بەرێ لەپی رەش نەبیت تاما زاری خۆشنابیت (پ)) |
| لەپك | دەسکێش ، دەستانە |
| لەپە قۆت | لەپە کوتێ |
| لەپەقوت | ئەنگوستەچاو ، تاریکایی شەو ، تاریکستان |
| لەتان | نیشتەجێ |

| | |
|---|---|
| لەتاندن | نیشتەجێکردن |
| لەحتك | پارچەیەکی بچووك لە زەوی |
| لەخرینی | ئەرخینی ، ناشتاو |
| لەڕ | لاواز ، لەغەر |
| لەرزك | لەرزین ، تا لەرزە ، لەرزین لە سەرما |
| لەرزەك | لەرزۆك ، ناجێگیر |
| لەرزك | تالەرزە ، تاولەرز |
| لەز | پەلە ، خێرا ، دەستبەجێ |
| لەزا لەز | بەپەلەپرووزێ ، پەلەپەل ، بەهەلەداوان |
| لەزاندن | پەلەکردن |
| لەزاهی | هەڵپە ، پەلەیی |
| لەزکانی | بەپەلە |
| لەزکرن | پەلەکردن |
| لەزکی | دەست بەجێ |
| لەزگین | خێرا ، دەستبەجێ |
| لەزو بەز | زۆر بەپەلە |
| لەزۆك | بەپەلە پەل ، هەڵپە |
| لەزۆکی | پەلەیی ، هەڵپەیی |
| لەزین | خێرا |
| لەزین | دەستوبرد ، بەپەلە پەل |
| لەز لەز | پەلە پەل |
| لەش | لاشە ، بەدەن ، قالب ، جەندەك ، جەستە |
| لەشخۆش | تەندروست ، ساخلەم ، ساغڵەم |
| لەشخۆشی | تەندروستی |

| | |
|---|---|
| لەشکەر | لەشکر ، سۆپا |
| لەشکر | سوپا |
| لەشکەری | سوپایی |
| لەشکرگەھ | لەشکرگا ، بنکەی سۆپا |
| لەشکگر | بەقەلافەت ، زەبەڵاح ، کەتە |
| لەشگران | تەنبەل ، تەوەزەل |
| لەشگر | زەبەڵاح ، بەقەڵافەت |
| لەش سڤك | چوست و چالاك ، سووکەڵە ، لەش سووك |
| لەعین | نەفرەت لێکراو |
| لەغەر | لاواز |
| لەفاندن | تێئاڵاندن |
| لەڤاکرن | جیاکردنەوە ، بەشکردن |
| لەڤا | بەش ، پارچە |
| لەڤابوون | بەشبەشبوون |
| لەڤەن | قامیش |
| لەڤەند | لاوی چاك و باڵا بەرز |
| لەڤەندی | لەوەندی ، فەقیانە |
| لەق | گاز ، قەپ |
| لەق | ناقایم ، بن سست |
| لەقاندن | سستکردن و لەراندن |
| لەقان | جوڵان |
| لەقدان | گەستن |
| لەقبوون | سستبوون |
| لەقکرن | لەقکردن ، سست کردن |

| | |
|---|---|
| لەقلەقۆك | لەرزۆك ، ناجێگیر |
| لەقلەقی | لەرزۆك |
| لەقە لەق | جوڵە جوڵکردن بەم لاو بەو لادا |
| لەقیان | هەژان |
| لەقی | سستی |
| لەق هاڤێتن | گازگرتن |
| لەق وەشین | گازگرتن،لەق هاڤێتن |
| لەکلەك | لەقلەق |
| لەکە | لۆمە ، تەعنە |
| لەگلەك | لەقلەق |
| لەگلەگە | لەقلەق |
| لەگەن | لەگان ، قاپێکی گەورەیە |
| لەلاڤ | ئاووبەفر ، شلۆڤە ، شڵێوە |
| لەما | بۆیە |
| لەمپە | لەمپا ، چرا |
| لەمساندن | خڕکردنەوەی ئەندامانی لەش لە ترسی سەرماو سۆلە ، هەلتروشکاندن |
| لەمسین | لەمساندن |
| لەمێژ | نوێژ |
| لەندك | بێشکە ، لاندك ، دەرگوش |
| لەنگەر | پای سەقەت ، لەنگر ، شەل |
| لەنگەری | شلی ، سەقەتی ، لەنگری ، شەلی |
| لەنگی | دەردی شلی |
| لەنگین | شەلین |
| لەنگی | شەلی |

| | |
|---|---|
| لەنگی | کەم و کوڕی |
| لەنگ | شەل |
| لەنگ | ناهاوسەنگ |
| لەنگەری | دەفرێکە لە مس دروستدەکرێت خۆراکی خەست وشکی تیادا هەڵدەگیرێت |
| لەمن | لانەی ورچ |
| لەمندك | بێشکە ، لاندك |
| لەمندك هەژین | لاندك راژێن، |
| لەهەنگ | قارەمان ، پاڵەوان |
| لەهیستۆك | گەمەکەری کارامە |
| لەهیستن | گەمەکردن |
| لەهی | لافاو ، سێڵاو ، لێمشت ، لێسەر |
| لەهی رابوون | لافاوهەستان |
| لەوا | بۆیە ، لەبەر ئەوە |
| لەوتان | پیسبوون |
| لەوتاندن | پیسکردن ، هەڕماندن |
| لەوتی | پیسکراو |
| لەوتین | لەوتان |
| لەوتیان | پیس بوون |
| لەوچە | تروهات ، بێ تام |
| لەوچە | چەنەباز ، بەوکەسە دەگوترێت کەزۆر قسان دەکات |
| لەوڕا | بۆیە ، چونکە |
| لەوڕانێ | لەوڕا |
| لەوڕە | لەبەرئەوە |
| لەوز | وتە ، بێژە ، زاراوە ـ (ب لەوزەکا خۆش و پەتی باخڤە) |

| | |
|---|---|
| لەوزە | گۆتن و قسە ـ (ئەڤ لەوزە ژ دەڤێ من نە هاتیە دەر) |
| لەوزە | بادامەی بن گەردەن ، بن حەفك |
| لەولەب | رۆژگار ، دەوران |
| لەوما | بۆیە ، لەبەر ئەوە |
| لەوماكو | چونكە |
| لەوەت | پیس ، قرێژ |
| لەوەن | قامیش |
| لەوەندی | فەقیانە، هوچك |
| لەیڕابوون | لێشاوهەستان ، لافاوهەستان ، لێسەر رابوون ، لێمشت رابوون |
| لەیز | گاڵتەو یاری ، سەما ، رەقس |
| لەیزۆك | گەمەكەرو یاریكەر |
| لەیزتۆك | ئامرازی گەمەكردن |
| لەیزتن | سەماكردن ، یاری كردن |
| لەیزەن | گەمەكردن |
| لەیزین | یاریكردن |
| لەیس | لەیز |
| لەیستن | لەیزتۆك |
| لەیستن | یاریكردن |
| لەیستۆك | بووكە شووشە |
| لەیی | سێلاو ، لێشاو |
| لیان | جۆرە پێڵاوێكە بۆ سەر بەفر لەپێ دەكرێ |
| لیان | لاكان |
| لیانە | لیان |
| لیت | لۆت |

| | |
|---|---|
| لیتك | بازدانی بە تەوژم |
| لیچ | لچق |
| لیچ | لینج |
| لیر | زیپکەی پانکە لەسەر پێست |
| لیرە | جۆرە پارەیێکە |
| لیرە | دراوێکە لە زێڕ |
| لیز | پەناگە، هێلانە |
| لیزتن | یاری کردن، کایەکردن، گەمەکردن |
| لیزۆك | زۆر گەمەکەر |
| لیزەڤان | هەڵپەڕکێ کەری شارەزا |
| لیس | کولانەی مریشکن ، کولکێ مریشکا |
| لیس | لووس ، حلوی |
| لیستۆك | بووکە شووشە |
| لیستەك | گەمە ، گاڵتە |
| لیستن | یاری کردن |
| لیسە | کولانەی مریشك |
| لیفك | لفکە ، لیفکە |
| لیڤ | لێو |
| لیڤان | لیوان، گلاس ، ترار ، جام |
| لیڤە | شێت ، دین |
| لیڤەن | قامیش |
| لیڤە | بوار ، هەل ، دەرفەت |
| لیڤەپەرێس | هەڵپەرست |
| لیڤەخاز | هەڵپەرست |

| | |
|---|---|
| لیم | ڕەمل ، قرپێژ ، لم |
| لیم | لم |
| لین | کۆپەی گەورەی ئاو تێکردن |
| لینە | لین ، کۆپە |
| لینەچێکەر | لینە دروستکەر |
| لینەساز | لینە دروستکەر |
| لیهان | لانکان ، لیان |
| لیوك | لیر |
| لێب | فێڵ ، حیلە |
| لێب | فێڵ و تەڵەکە بازی |
| لێبۆك | فێڵباز |
| لێبۆکی | فێڵبازی |
| لێباندن | فریودان |
| لێباندی | فریودراو |
| لێبوون | لەشوێنێك پەیدابوون |
| لێبوون | لێبوونەوە،ژێبوون - (بەلگێن ڤێ داریَ لێبوون) |
| لێبوونەڤە | لێبوونەوە ، دەست لێهەلگرتن |
| لێبۆر | بەخشندە |
| لێبۆردە | بەخشندە،عەفۆکەر،چاوپۆشیکار |
| لێبۆرەر | بڕوانە:لێبۆردە |
| لێبۆرین | بەخشین،عەفۆکردن،چاوپۆشیکردن |
| لێبۆری | بەخشراو،عەفۆکراو،بۆراو |
| لێباتۆك | هەڵخەڵەتێنەر |
| لێباتۆکی | چەواشەکاری |

| | |
|---|---|
| لێپ | لێب |
| لێپووك | ئەوەی لاسایی خەڵك دەكاتە بە مەبەستی پێكەنین |
| لێحەیتاندن | لێخۆڕین |
| لێخافڵبوون | لێغافڵبوون |
| لێخڕڤەبوون | لە دەوریا كۆبوونەوە |
| لێخە | لێدە |
| لێخەر | لێدەر |
| لێخستن | لێدان |
| لێخن | لێدەن |
| لێخوڕین | هاژووتن |
| لێخوڕین | هەڕەشەلێكردن و تێخوڕین |
| لێدان | قوتان |
| لێڕ | دارستان ، جەنگەل |
| لێڕستان | دارستانی پڕی چڕ |
| لێڕا برین | بەكنیدا روویشتن ، بەلایدا دەربازبوون |
| لێڕامینە | تەماشاكە ، بنوارە ، مێزەكە ، بنێڕە ، هێڤدەرێ |
| لێڕاوەستان | لە شوێنێك راوەستان |
| لێركۆكە | ئێرانە |
| لێز | خزم |
| لێزان | پسپۆر ، شارەزا |
| لێزانی | شارەزایی |
| لێزم | خزمی نزیك |
| لێزمی | خزمایەتی |

| | |
|---|---|
| لێسەر | لافاو ، لێمشت |
| لێسەرڕابوون | لافاوهەستان |
| لێشاڤ | لێشاو |
| لێف | لێفە |
| لێفان | لێشاو |
| لێڤ | لێو ، لێڤ |
| لێڤ | قەراغ |
| لێڤ ڕێژ | پڕاو پڕ ، لێواو لێو |
| لێڤ شەکر | قسە شیرین |
| لێڤ شەکەر | قسەشیرین |
| لێڤ شۆڕ | روگرژ ، غەمبار ، لێو شۆڕ |
| لێڤۆك | کەسێکە کە زۆر داوای شت بکات لە خەڵك |
| لێڤەبوون | دەست لە کارێك هەڵگرتن |
| لێڤەبوون | پاشگەزبوونەوە ، پەشێمانبوونەوە |
| لێڤە پێچ | لێپێچەر |
| لێڤەنێڕ | بەسەرکەرەوە |
| لێڤەنێڕی | بەسەرکردنەوە |
| لێڤە پێچان | لێ پێچانەوە |
| لێڤە نێڕین | تەماشاکردنی بۆ دۆزینەوە ، لە دوای شتێك گەڕان |
| لێڤەخارن | لێ خواردنەوە |
| لێڤەگر | لێوەرگر |
| لێڤەخوارن | لێ خواردنەوە |
| لێڤەدان | دەلاندن |
| لێڤەدان | هەڵدانی شتێك لە شوێنێك |

| | |
|---|---|
| لێڤەرسیان | لە شوێنێکی بەرز بەربوونەوە ـ (ئەز ژ بانی ڤەڕسیام) |
| لێڤەرسیان | لەکاربوونەوە ، دەست لەکار هەڵگرتن پاش تەواو بوونی |
| لێڤەرگرتن | لێ سەندن ، لێ وەرگرتن |
| لێڤەگرتن | نەخۆشی لەکەسێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر پێی دەڵێن لێڤەگرتن ، پەژی ، پەتا |
| لێڤەگێڕان | وەڵام دانەوەی قسەی بەرامبەر |
| لێڤەگێڕان | لێسەندنەوە ، ژێوەرگرتن ، لێستاندن |
| لێڤەکرن | لێکردنەوە ـ (بەرێ ڤێ دارێ لێڤەکە) |
| لێڤەکرن | پشێمان کردنەوە ، پاشگەزکردنەوە ـ (ژ سۆزا خۆ لێڤەکە) |
| لێڤەکولین | لێکۆڵینەوە |
| لێڤك | لێوار ، قەراغ |
| لێڤکرن | گۆتن ، ئاخاوتن |
| لێڤکی | زارەکی ، دەڤکی |
| لێڤ و لمۆر | سەرو بچم ، روخسارو روومەت |
| لێڤە پێچ | لێکۆڵەر |
| لێڤ ڤەکرن | بەقسە هاتن ، قسەکردنی منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا |
| لێڤان لێڤ | پڕ ، لێوان لێو ، تەژی ، تژی ، مشت |
| لێڤار | لێوار ، قەراغ ، کەنار ، گڤاندە ، تەنیشت |
| لێقەومی | لێقەوما ، گرفتار |
| لێقەومین | لێقەومان ، کارەسات بە سەر هاتن |
| لێك | وەك یەکتر،ژێك ـ (کراسێن مە لێکن) |
| لێك | دەگ، بەسەر یەکەوە ـ (لێك لێك بەفر باری) |
| لێککرن | بڕوانە تێکبەردان |
| لێکئالیان | تێکئاڵان |

لێکئانین		ڕێکخستن

لێکبۆرین		یەکتر بەخشین ، چاوپۆشی لە هەڵەکانی یەکترکردن

لێکبۆرین		لەیەکتر گوزەرکردن ، لەیەکتر تێپەڕین

لێکبوون		لەیەکتر جیابوونەوە،ژێکڤەبوون ـ (ئاری و هەڤالێ خۆ ل سەر ناپاکیێ لێکبوون)

لێکبین		لێکبوون

لێکەر		ئەوەی گەنم و دەغڵ لە ئاش دەکات

لێکەفتن		لێکەتن ، بەینیان نەما

لێکەفتی		بەرکنار کراو ، دەرکراو لە سەر کارێك

لێکەفتی		ئەو شوێنەی لێ کەوتبوو خوارەوە

لێکخۆڕین		گەف و هەڕەشە لە یەکتر کردن

لێکدان		تێکەڵ کردن

لێکدان		لەیەکتریدان

لێکرن		هاتنی باران ـ (های لێکر لێکر ، بارانێ لێکر ، خەملا گوندێ مە دیسان دەستپێکر (ھ))

لێکرن		دەغڵ لە ئاش کردن

لێکگوهارتن		لێکگۆڕینەوە

لێکڤە گێڕان		قسە لەقسەی یەکتردان ، لێك گوڕینەوەی قسە

لێکڤەبوون		لەیەکتر جیابوونەوە

لێکڤەبین		لێکڤەبوون

لێککەفتن		بەشەڕهاتن ، لە یەکتر زویر بوون

لێککەفتن		خۆ لەیەکتر دان ـ بێ دەستی ئەم لێککەفتین

لێك لێك		بەبەردەوامی ، بەسەریەکەوە ، دەگ ـ (مە لێك لێك شولکر )

لێکهاتن		بۆ یەکتری شیان و بەکار هاتن

| | |
|---|---|
| لێکوەرهاتن | لە دەوری یەکتر کۆبوونەوە |
| لێکبەر | میرات لەیەکتر بردن |
| لێکڤەدان | لێکدانەوە |
| لێکدانەڤە | لێکدانەوە |
| لێکولەرڤان | لێکۆلەر |
| لێك و لێك | بەبێ وچان ، بەبێ وەستان ، بەبێ پچڕان ، دەگ |
| لێکخرڤەبوون | لەیەکتری کۆبوونەوە |
| لێکی | چەشنی یەکتر |
| لێکی | بەبەردەوامی ، بەسەریەکەوە ، دەگ |
| لێگەڕهان | لێگەڕیان |
| لێگەڕیان | واز لێنان ، دەست لێهەلگرتن |
| لێگەڕیان | لێگەڕان ، دواکەوتن بۆ دۆزینەوە |
| لێگر | عەیب دۆزەرەوە |
| لێگرتن | نەبەخشین |
| لێگرتن | زەوتکردنی شتێك لە کەسێك ، زەوتکردن |
| لێگرتن | بژارەکردن ، جیاکردنەوە |
| لێگەڕ | گەڕۆك ، دۆزەرەوە ، سۆراغگر |
| لێل | نیوە مەیین ـ (شیرێ مە یێ لێل بووی) |
| لێلاڤ | لاولاو |
| لێلاڤ | ئاوی بەفراوی ـ (ئەڤ ئاڤە یا بۆیە لێلاڤ) |
| لێلاڤ | ئاوی پیس و چلکن |
| لێلکرن | رۆچاندنی توێکلی گوێز یا باوی و بادام بەتەڕی |
| لێمشت | لافاو ، لێسەر ، لەهی ، تۆفان |
| لێنەگرتن | بەخشین |

| | |
|---|---|
| لێنەڕین | لێڕوانین ، تەماشاکردن |
| لێنهێڕین | لێڕوانین |
| لێهاتی | شیاو ، لێهاتوو |
| لێهاتن | تووش بوونی جەستە بەشتێك وەك زیپکەو لیر ـ (بۆچی سەر و چاڤێن تە لیرە لێهاتن ؟) |
| لێهاتن | لێهاتوویی ، شایستەیی |
| لێهەتکاندن | پیسکردنی شتێك لەلایەن کەسێکەوە ـ (ئاڤا وی لێ نە هەتکینە !) |
| لێهەستان | بەگژداچوون ، دەست هەڵنان |
| لێهەلمالین | کەسێ خۆراکی کەسێکی تر بخوات ـ (ئاری فراڤینا ئازادی لێهەلمالی) |
| لێهلدان | هەڵدانی شتێك لە شوێنێك |
| لێهمشت | لافاو ، لێسەر |
| لێهەلاندن | نەویستن ، لەخۆ دوورخستنەوە |
| لێهایدان | پێڕابەردان ، لێ بەخەبەر هێنان |
| لێوەرگرتن | لێ سەندن |
| لێوەرگێڕان | لێوەرگەڕاندن |
| لێوەرهاتن | کۆبوونەوە لەدەوری کەسێك یان شتێك |
| لێوەستان | لە شوێنێك راوەستان |
| لێوەشاندن | لێخستنەخوارەوە |
| لێوەشیان | شایان بوون ، لێوەشانەوە |
| لێوەشیان | لێکەوتنەخوارەوە |
| لێوەشیای | لێوەشاوە ، شایان ، شایستە |
| لێوەستان | دەست لێهەڵگرتن |
| لێ | بەڵام |
| لێ | لەوێ |

| | |
|---|---|
| لێ ئانین | لەشتێك هێنان ، لێهێنان |
| لێ بەلێ | دەئیتر ، دەباشە، ئەمما ، بەڵام |
| لێ نێڕین | تەماشا كردن ، لێ روانین |
| ل | لە ـ ل دەڤ من بمینە |
| ل بال | لەكن ، لەلا، لبا ، ل جەم |
| ل پاش | بێ برەو ، لە پاش، پاشكەوتوو، دواكەوتوو |
| ل پاشمان | لە پاش بەجێمان ، پاشماوە |
| ل پاشمان | دواكەوتوویی ، پاشكەوتوویی |
| ل پاشمای | لە پاش بەجێماو ، پاشماوە |
| ل پاشمای | هەر شتێك پاش مردنی لە كەسێكەوە بە میرات بە جێ بمێنێت، |
| ل پێش | پێشڕەو ، لەپێش ، بەقەدرو حورمەت |
| ل پێش | پێشەكی ، سەرەتا |
| ل پێش | لەپێشەوە |
| ل پێل بوون | شەپۆل دان |
| ل پێلان | شەپۆلدان |
| ل پێ كرن | لە پێ كردن |
| ل خۆ چوون | لە خۆ چوون ، ئاگا لەخۆ نەمان |
| ل خۆ گرتن | گرتنە خۆ |
| ل خۆدان | بە چەپۆك سینگ و سەر كوتان |
| ل خۆدان | لە خۆدان |
| ل خۆدان | ژیانەوە ، گەورەبوون |
| ل دیڤ هەڕ | سۆراغگر |
| ل دیڤهەڕی | بەدواداچوون ، سۆراغگرتن |

| | |
|---|---|
| ل دیڤهەڕی | کلکایەتی ، دیڤەلانکی |
| لەز | لەز ، پەلە |
| لژنە | لێژنە |
| ل سەرڤە | دیوی دەرەوەی شتێك ، بەزاهر |
| ل سەر | لەلای سەروو ، لەسەر |
| ل سەر خۆڕا | دەگەل ئەوەشا کە بۆ خۆشی وایە ، لەگەڵ ئەوەش |
| ل سەرخۆ | ئارام و بەپشو ،بە حەوسەڵە ، لەسەرەخۆ |
| ل گۆر | بەپێ |
| ل گەچوون | دەرچوونی جومگەو لە جێ چوونی |
| ل هەڤ | رێك و پێك و لەبار |
| ل هەڤدان | یەکتر قوتان،لە یەکتردان |
| ل هەڤدان | ئاوێتەی یەکترکردن |
| ل هەڤپێچان | لێکئالاندن |
| ل هەڤخست | لێکیاندا،یەکتریان قوتا |
| ل هەڤخستن | لێکدان ، لەیەکتریدان |
| ل هەڤکەتن | وێککەوتن ، دەمەقاڵە |
| ل هەڤهاتن | رێککەوتن |
| ل هەڤ وەرن | ئاشت ببنەوە ، پێکوەرن |
| ل هیڤی | بە ئاوات ، چاوەنوار |
| لهێم | لەحیم |
| ل ور | لەوێ - (ل ور بمینە هەتا ئەز تێم) |
| ل وی | لەو - (پەرتووکا من لوی وەرگرە) |
| ل وێ دەرێ | لەو شوێنە |
| ل وێ جارێ | ئەو جارە ، ئەو کەڕەتە |
| ل وێ گاڤێ | ئەو کاتە |



| | |
|---|---|
| ما | نەمرد ، ژیا |
| ما | تۆبلێی ـ (ما دێ پێشکەڤین ؟) |
| ما | مەگەر ـ (ما خەتێن منن) |
| ما | ئایا ـ (ما ئەم ناچینە دهۆکێ ؟) |
| مابەین | نێوان ، ناڤبەر |
| مات | تەبەل ، کەلای بازی ، هەڵمات ، مووشێن ، کەل |
| ماتانێ | (ماتان ، کایەی کەلانێ) |
| ماتێچون | هەبوونی مافی بەدواداچوون |
| ماتێکرن | خۆ لە کاروباری کەسێکی تر هەڵقورتاندن |
| ماتێکەر | فزۆڵ،مایتێکەر،دەست خستنە ناو کار وباری کەسێکەوە ،بەبێ ئەوەی مافی ئەو کارەی هەبێت. |
| ماچ | رامۆسان |
| ماچانێ | یەکتر ماچکردن |
| ماچیك | ماچ ، رامۆسان |
| ماخۆ ؟ | وامەزانە ـ (ماخۆ ئەزێ بێکەس نیمە) |
| ماداك | مێی گامێش |
| مادەم | جا کەوایە |

| | |
|---|---|
| ماركرن | ماره برين |
| مارگر | كەسێ كەكارى مارگرتنه |
| مارگەستى | مارانگاز ـ (مار گەستى ژ وەريسى دترسيت ( پ )) |
| مارگيسك | مارمێلكه |
| مارەبەند | مارەبڕين |
| مازيچن | مازووچن |
| مازيه پشت | بڕ بڕەى پشت |
| مازى | بڕ بڕەى پشت |
| مازى | مازوو |
| ماستاڤ | ماستاو |
| ماستاڤچى | ماستاوچى ، پانكەرەوه |
| ماستڤان | ماستفرۆش |
| ماسك | دەمامك |
| ماسك بەند | دەمامك پۆش |
| ماسيڤان | راوكەرى ماسى |
| ماسيڤانى | ماسيگرى |
| ماسيگر | كەسێ راوه ماسى بكات ، راوكەرى ماسى |
| ماسيلكه | ماسولكه |
| ماسيڤان | ماسى گر |
| ماشك | ماشه ، ماش |
| ماف | بەش |
| مافير | مافوور |
| مافيرك | مافوور |
| ماك | بنچينەو بناغەى هەر شتێك ، چاوگ |

| | |
|---|---|
| ماك | دايك |
| ماك | سەروچاوە |
| ماكاڤ | جۆگەی گەورە كە جۆگەی تری لێ دەبنەوە لە ئاوداشتندا |
| ماكەر | دێڵەكەر، ماكەر |
| ماكەو | كەوی مێ ، مێكەو |
| ماكی؟ | ئەدی كێ ، كێ هەیە؟ ـ (ما كی دێ مافێ مە ستینیت ؟) |
| مال | خانوو ، جێ ژیانی خێزان |
| مال | سەرمایەو پارەو پوڵ |
| مالا من | ماڵەكەم |
| ماڵات | ئاژەڵ ، حەیوانات،تەرش وتەوال |
| مالاڤا | سوپاس |
| مالاڤا | خوا حافیز |
| مالاڤایی | خوا حافیزی |
| مالا من | داخەكەم ـ (مالا من بۆ تە هەر ێ بیت) |
| مالا میر | كۆشكی خان |
| مالا | ماڵەكان |
| مالان | ماڵەكان ، دانیشتوانی ئاوایی |
| مالبات | خێزان |
| مالپێچ | منداڵدان ، زارۆكدان ، پزدان |
| مالخێ | ماڵخۆ ، خاوەن ماڵ |
| مالخەراب | ماڵ وێران |
| مالدۆخین | كەمەر ، شوێنی بەستنی دۆخین (بەنەخوێن) |
| مالدێرس | ماڵ خراپ |
| مالشتەر | گەسكدەر |

| | |
|---|---|
| مالشتن | مالّین |
| مالشتن | گەسك دان ، رادان |
| مالکەتن | لە مالّ و دارایی بەش بڕان |
| مالکەتی | شکەست خواردوو لە بازرگانی کردندا |
| مالك | ریز ، بەیت |
| مالمالانێ | خانووچکە دروستکردنی زارۆکان ، مالّەباجێنە |
| مالمیرات | مالّ کاول ، وەچاغ کوێر |
| مالە | ئامرازی قوڕ لووس کردن ، مالنج |
| مالّخۆ | خانەخوێ ، خاوەن مالّ |
| مالّدار | دەولّەمەند ، ئاژەلّدار |
| مالّداری | کەیوانویی ، دەولەمەندی |
| مالین | سڕین |
| مالین | ساوین |
| مال خراپ | مالّ وێران |
| مال مالە | تاك تاکەی مالاّن |
| مام | مامە ، ئاپ |
| مام | نەمردم |
| ماما | مامە |
| مامز | ئاسك ، کەژالّ |
| مامك | مەتەلّۆکە ، مەتەلّ |
| مامۆ | مامە ـ وشەی ڕێزگرتن لەکەسی پیر ـ (مامۆ وەرە ئێرە روینە) |
| مامۆستا | فێرکار ، سەیدا ، هیڤان |
| مام هۆستا | مامۆستا، مامە وەستا |
| مامیك | مامە |

| | |
|---|---|
| مان | نەمردن ، لە ژیان بوون |
| مان | نەچوون |
|ماندەل | نکوڵی ، حاشا ، ئینکار |
| ماندەلی | نکوڵی ، حاشایی |
| ماندەلکرن | حاشاکردن |
| ماندەلا | بڕوانە ماندەل |
| ماندی | شەکەت ، ماندوو |
| ماندلا | حاشا ، ئینکار |
| مانع | لەمپەر ، بەرگر ، رێگر |
| مانە | ئایا وانیە ؟ (ما نە وەسایە ؟) |
| مان و نەمان | مردن و ژین ، هات و نەهات |
| مانێ | ئاخر ـ (مانێ ئەز زۆر حەژ تە دکەم) |
| ماهین | ئەسپی مێ ، ماین |
| ماهی | بەرازی مێ ی(١٢) بەچەیی |
| مایتێکەر | خۆتێهەڵقورتێن |
| مایتێکەری | خۆتێهەڵقورتاندن |
| مایە | ماوە |
| مایین | مانەوە ، هەرمان |
| مایی | نەمردوو ، زیندوو |
| مت | مات و بێ دەنگ ، کڕ |
| متا | کەل و پەلی بازاڕ |
| متاچی | کەل و پەل فرۆش ، ئازووقەفرۆش |
| متاندن | لەزەوی توندکردن |
| متکرن | خۆماتدان ، خۆمەڵاسدان |

| | |
|---|---|
| متمتی | کڕومات ، بێدەنگ |
| متومۆن | نێوچەوان گرژ ، رووگرژ |
| متێل | ئەو داوەی ناوەڕاستی دۆشەك و لێفی پێ دەدورنەوە |
| مجتی | بەجیدی ، مکوڕی |
| مجك | جیدی ، مژداهی |
| مچ | رژد ، رەزیل |
| مچاندن | رەزیلی کردن ، دەست قوچاندن |
| مچراندن | دەست خستنە ناو دەستەوە ، تەوقەکردن |
| مچقاندن | ئاو لەسەر چاوە وشك کردن |
| مچقین | وشکاو هاتنی کانیاو ـ (بیرا مە مچقی) |
| مچلگە | گرەوکردن لە سەر شتێك |
| مچلگەهـ | گرەو لەسەر شتێك کردن |
| مچوو | دەست گرتوو ، رەزیل |
| بچووك | مچوو |
| مچومۆن | رووگرژ |
| مچومور | رووگرژ |
| مچومۆن | رووگرژ ، مرومۆچ |
| مچەك | مستێك ، پڕی ناو لەپی دەستێك |
| مچیان | بەسەریەکا گۆشین ـ (دەستێ خۆنە مچینە، تۆڤێ خێرێ بچینە) |
| مچینك | ئەوەی دەست دەقووچێنێ |
| مچینك | مووکێش |
| محسك | خۆف و پێلاو |
| محەس | ئەو پارچەئاسنەی لەشی وڵاخ پێ دەخورێنن |
| محەسکرن | خوراندنی لەشی ولاخ بەمحەس ، قەشاویش کردن |

| | |
|---|---|
| مخابن | بەداخەوە ، حەیف ، داخەکەم |
| مخرك | دوژمن ، ناحەز ، نەیار |
| مخل | ئارد بێژ ، بێژنگی زۆر کون تەنگ ، هێلەگ |
| مخل | شوێنی حەسانەوەی مەڕومالاّت |
| مدۆر | مودیر ، کارگێڕ ، بەڕێوەبەر |
| مدەڕك | رکابەر |
| مدەڕکی | رکابەری |
| مدەك | دەمێك ، سەر وەختێ |
| مر | مریشك |
| مر | مرد ، وەفاتیکرد ، کۆچی دوایی کرد ، گیانی دەرچوو |
| مراد | ئارەزووی دڵ ، مراز ، مەبەست |
| مرار | مردار |
| مرار خۆر | لاشەخۆر ، حەرام خۆر |
| مرارخۆری | لاّشەخۆری ، حەرامخۆری |
| مراری | دوڕ ، لولو ، مرواری |
| مراری | مرداری |
| مراری | ناوی ژنانە |
| مراز | مەبەست ، نیازی دڵ ، مراد |
| مرازدار | نیازدار ، مەبەستدار |
| مراڤی | مراوی |
| مراندن | کوشتن،مریاندن |
| مرج | جۆرە گەنمێکە |
| مرچ | دەنگی ماچکردن |
| مرچقاندن | لە ناو پەنجەدا گوشین |

| | |
|---|---|
| مرچقین | هەڵقرچان |
| مرمرك | جۆرە مێشولەیەکە |
| مرن | مردن |
| مرۆڤ | بنیادەم ، مرۆ |
| مرۆڤاتی | پیاوەتی ، ئینسانیەت |
| مرۆڤانی | پیاوەتی |
| مرۆڤانی | خزمایەتی |
| مرۆڤایەتی | مرۆڤانی |
| مرۆڤدوست | مرۆڤپەروەر |
| مرۆڤدوستی | خۆشەویستنی مرۆڤ ، مرۆڤپەروەری |
| مرید | تۆبەکاری سەردەستی شێخ |
| مریسۆك | مژمژۆك |
| مریسین | مژین |
| مریسان | مژین |
| مریساندن | مژتن |
| مریشك | مامر |
| مریشۆ | مردووشۆر |
| مریك | مردوو |
| مرێك | ئاوێنە ، نەینیك ، خۆدیك |
| مری | مردوو |
| مز | مزر، ترش و شیرین |
| مز | حەقدەستی ئاشەوان |
| مزاور | فێڵبازی بێ بەڵێن |
| مزاوری | فێڵبازی، قۆپیاکاری، گزیکاری |

| | |
|---|---|
| مزگەفت | مزگەوت ، شوێنی خواپەرستی موسوڵمانان |
| مزگین | مژدە |
| مزگینئانین | مژدەهێنان |
| مزگینی | مژدە |
| مزگیندەر | مژدەدەر ، مژدەهێن |
| مزگینیدەر | مزگیندەر |
| مزگینڤان | مژدە بەخش ، موژدەکار |
| مژ | تەم ، دومان |
| مژار | بابەت |
| مژانە | دارێکە لەنیرو ئامۆردا ـ (ترانە دبنە مژانە ـ (پ)) |
| مژانگ | برژانگ |
| مژاندن | مژتن |
| مژتن | مژان |
| مژداهی | جیدی ، مجتی |
| مژول | خەریك ، سەرقاڵ ، سەرگەرمی کار |
| مژولاهی | خەریکی ، سەرگەرمی |
| مژوو | نانێك کەبەهۆی کۆن بوونییەوە چێژەکەی گۆڕابێت |
| مژووبوون | کۆنبوونی نان و گۆڕانی تام و چێژەکەی |
| مژویلی | مژولاهی ، خەریك بوون ، سەرقالی |
| مژۆڵ | برژانگ |
| مژۆلانك | برژانگ |
| مژیلانگ | مژانگ |
| مست | پەنجەی پێکەوە چەسپێنراو ، بۆکس |
| مستانێ | شەڕە بۆکس ، مشتەکۆڵە |

| | |
|---|---|
| مسدان | مست هاوێژتن |
| مسری | ئافرەتی لاواز |
| مسڤان | مسچێکەر |
| مسەب | ئایینزا ، مەزهەب |
| مشار | هەڕە ، بڕەك |
| مشار | پێوانەیەك لەزەوی کێلان بۆ تۆو کردن و نەمام چاندن |
| مشاییخ | پیاوچاکی مردوو |
| مشت | پڕ ، لێواو لێو ، تەژی |
| مشتاخ | شەیدا ـ ئارەزوومەند ـ (ئەز مشتاخێ کوردستانی مە) |
| مشتاق | مشتاخ |
| مشتاخە | ئەو شوێنەی ترێ لەناوی دادەنرێت بۆ وشکبوونەوەو ئەو ترێیەش بەو ناوە ناوزەد دەکرێت |
| مشتخانە | گرەو ، مەرجانێ |
| مشتکرن | پڕکردن |
| مشتن | بەگسك خاوێنکردنەوە |
| مشتی | پڕی ، تەژی |
| مشلاق | بەرامبەر ، هەڤبەر ، هەمبەر |
| مشە | زۆر ، بۆش ، گەلێك ، زەحف ، زیاد |
| مشەخت | ئاوارە ، دەربەدەر ، کوچبەر،پەنابەر،پەناهەندە |
| مشەختبوون | ئاوارەبوون ، پانەهەندەبوون،کۆچبەربوون |
| مشەختی | دەربەدەرکراو، ئاوارەیی |
| مشەمر | ئەشیای بێ خاوەن |
| مشەوش | لە دانەکانی نیسك |
| مشەوش | شەپرزە ، ئالۆز ، پەشۆکاو ، شلەژاو |

| | |
|---|---|
| مشەوشبوون | شەپرزەبوون |
| مفا | سوود ، قازانج ، فایدە |
| مفسك | سوزگی شت پاڵاوتن ، مسفی |
| مقات | وشیاربوون |
| مقەسۆك | جۆرە باڵندەیەكە |
| مكارە | ئامرازی دار كۆڵین |
| مكرۆك | فێڵباز ، تەڵەكەباز |
| مل | شان ، قۆڵ |
| مل | زەمینی بەرزو بڵند ـ (سەیران ل ڤان ملا خۆشە) |
| مل | لا ، تەنیشت |
| ملا | بڵندایی و بەرزایی |
| ملا | مەلا ، پیاوی ئاینی ئیسلام |
| ملان | شوێنی بڵندو بەرز لەزەمین |
| ملانێ | بەربەرەكانێ ، ململانێ |
| ملئالین | ملپێچ |
| ملبادان | ملسوڕاندن ، سەرپێچیكردن |
| ملبەرنان | شان دانەبەر كارێك یان شتێك ـ (هەڵگرتنی بەر پرسیاریەتی) |
| ملبەند | گەردەنبەند ، ملوانكە ، رستك |
| ملبەڕابرن | شاندانەبەر ، زیادەخوازی |
| ملپان | تەنبەل و تەوەزەل ، مل ئەستوور |
| ملچ | مرچ |
| ملچ | مستێك لە هەرشتێك |
| ملچاندن | مرچكردن ، دەنگ لەدەم هاتن |
| ملخلیان | مل شكان |

| | |
|---|---|
| ملكرن | لەسەرشان دانان |
| مللەت | گەل ، میللەت ، نەتەوە |
| ملنەبادان | گوێڕایەڵ بوون ، سەرپێچینەکردن |
| ملۆل | دڵشکاو ، ڕەنجاو |
| ملەت | گەل ، نەتەوە |
| ملەك | بارێ کە دەخرێتە سەرشان |
| ملیاکەت | فریشتە |
| ملیتان | توندڕۆ |
| مل ب مل | شان بەشان |
| مل پێڤەنان | سوور بوون لەسەر کاری خۆی و گوێ بەقسەی کەس نەدان |
| مل خار | مل چەوت ، مل لار |
| مل شکەستن | مل شکان |
| مل شکەستی | مل شکاو |
| مل شکێنان | مل شکاندن |
| من | ئەمن ، خۆم |
| منفەعەت | سوود ، بەهرە ، مفا ، بەهرە |
| منمنیك | پەپوولە ، پەروانە |
| منمنۆك | منمنیك |
| منمنکەر | چپە وسرتەی ژێرلێو |
| منەت | سوپاس |
| منەتبار | سوپاسگوزار |
| منەتدار | سوپاسکەر |
| منەتکرن | سۆپاس کردن |
| منەت لێکرن | بەنێو چەوان دانەوەی چاکە |

| | |
|---|---|
| منەت ژێکرن | تاکلێکردن |
| منەمن | منجەمنج ، پرتەوبۆڵە |
| منەمنکرن | لەژێر لێوەوە قسەکردن |
| منێکار | منەتبار ، بەئەمەك ، ئەمەکدار ، سۆپاسگوزار |
| منێکاری | منەتباری ، سۆپاسگوزاری |
| منێکرن | منێ کاری ، سوپاسکردن |
| من ژی | ئەمنیش |
| منێ | خۆم ـ (ئاخ ل منێ) |
| منێ | مەمنونی ، تکا ، هیڤی ـ (منێ بکە هەتا دگەل تە دئاخڤم) |
| مه | مەڕ |
| مه | مانگ ، هەیڤ ، مەه |
| مهان | ماین ، مەین |
| مهاندن | مەیاندن |
| مهانه | بەهانە ، بیانو |
| مهان | ماین |
| مهانه | بەهانە ، بیانو ، پاساو ، هەنجەت |
| مهانەچی | بیانوچی ، بەهانەگر |
| مهتن | مژین |
| مهتۆك | مژەك |
| مهرەب | میحراب |
| مهه | شەراب ، مەی |
| مهین | ماین |
| مهی | مەڕ ، پەزێ سپی |
| موخابن | بەداخەوە ، حەیف ، مخابن |

| | |
|---|---|
| موخل | هێلەگ |
| موخل | جێگای حەسانەوەی ئاژەڵ و مەڕو ماڵات کاتی لەوەڕاندن |
| مودیل | مۆدێل ، مۆدە |
| مورکری | سەر بەستراو دەست لێنەدراو |
| مورکێن پشتێ | بڕبڕەی پشت |
| موزیك | مۆسیقا |
| موژەلانك | برژانگ |
| موشتاق | شەیدا ، تامەزروو |
| موغبەر | گۆڕستانن قەبرستان، زیارەت |
| موعیز | هەژار ، نەدار |
| موعیزی | هەژاری ، نەداری |
| موفا | سوود ، قازانج ، بەهرە |
| موڤك | یەك ئێسك لەبڕبڕەی پشت |
| موڤکێن پشتێ | مورووی پشت ، مرۆخەی پشت |
| موڤکامل | بەندوگەی شان و ملێ |
| مومی | جۆرە شەدەیەکە پیاوان لە سەری دەئاڵێنن |
| موهر | مۆر |
| موور | مێش و مەگەز |
| مویکار | سەرتاش |
| مویکارخانە | سەرتاشخانە |
| مویکاری | کاری سەرتاشین ، ئارایشگەری |
| موی | مو |
| مۆچك | کەوچکی دۆ |
| مۆچك | مێزانێکی بچووك و گچکەیە |

| | |
|---|---|
| مۆچنك | موكێش |
| مۆر | تەمغە |
| مۆراڤ | تەم ، مژ ، مۆران |
| مۆرك | شتی چکۆلەی سماو بۆ جوانی و خشلٚ |
| مۆرك | موورووی پشت |
| مۆرك | بڕبڕە |
| مۆركدار | بڕبڕەدار ، خاوەن بڕ بڕە |
| مۆری | مێروولە |
| مۆڤك | برگە |
| مۆڤك | جومگە |
| مۆڤكبەند | جومگەبەند |
| مۆڤەت | خوشەویستی |
| مۆلە | ئەو قوڕو خولەی دیواری پیٚ دەسون |
| مۆلەكرن | سونی دیوار بە قوڕ |
| مۆم | شەم |
| مۆمدان | شەمدان |
| مۆمك | شەمی بچووك |
| مۆن | مڕومۆچ ، روگرژ |
| مۆن | رووگرژ |
| مۆنیك | جومگەی پەنجەكان |
| مۆنی | روگرژی |
| مە | ئێمە ، خۆمان |
| مە بر | بردمان |
| مەت | پلك ، خوشكی باوك ، پوور |

| | |
|---|---|
| مەتاڵ | قەڵغان ، سپەر |
| مەتالڤان | مەتالۆان ، قەڵغانوان ، سپەرڤان |
| مەتح | سەنا ، پێهەڵگووتن |
| مەترەق | کوتکی ئاسن ـ (هەتا ڤێنەکەڤتن مەترەق نەگۆت سەدەق ( پ )) |
| مەترەلۆز | رەشاش ، شێستێر |
| مەتك | پلك ، پوور |
| مەتیك | بڕوانە:مەتك |
| مەتهەلۆك | مەتەڵ |
| مەتە | پلك ، پوور |
| مەتەرە | گۆزەی ئاو تێکردنی شوان و گاوان ، دێمك |
| مەتەکە | بڕوانە ، تەماشاکە |
| مەتەلۆك | مەتەڵ |
| مەتەلۆکڤان | مەتەڵبێژ |
| مەتەلە | مەتەڵ |
| مەتین | قایم ، پتەو |
| مەتێ | پلکەکەم |
| مەجرەفە | بەفرماڵ ، بەفریك |
| مەجمەعە | سێنی گەورە |
| مەجیدی | جۆرە دراوێکی سەردەمی کۆنە |
| مەچێتر | جنۆکە ، پەری |
| مەحان | قەڵاچۆ |
| مەحاندن | قەڵاچۆکردن ، قڕکردن |
| مەحتەڵ | مەحتەل ، ماتڵ ، گیروو |
| مەحتەر | خزمەتکاری ئەسپ |

| | |
|---|---|
| مەحفویر | مافوور |
| مەحفیرك | مافووری بچووك ، مەحفویرك |
| مەحفۆر | مافوور |
| مەحفیر | مافوور |
| مەحلاندن | لەناوبردن |
| مەحلین | لە ناوچوون |
| مەخسەد | نیاز ، مەبەست |
| مەخسەد | مەبەست ، مەرام ، نیاز |
| مەخەل | شوێنی دۆشینی مەڕو ماڵات |
| مەخەر | ئەو زەمینەیە کە فراوان و تەختاوییە |
| مەخەلهاتن | لە جێگای خۆ خڕ بونەوە ی مەڕو ماڵات بۆ حەسانەوە |
| مەدالی | میدالیا |
| مەدحۆك | خودپەسەند |
| مەدحۆکی | خودپەسەندی |
| مەدرەب | ئەو زەمینەی بۆ ئاودێران دەشێت |
| مەدەر | تکا |
| مەدەك | مێی گامێش |
| مەرتال | مەتاڵ ، قەڵغان |
| مەرجانێ | گرەو ، مەرجگرتن |
| مەرد | سەخی ، خاوەن پیاوەتی |
| مەردانە | وەك پیاوی باش |
| مەردوڕند | زۆر بە پیاوەتی و جوانی |
| مەردە مێر | جوامێر ، سەخی |
| مەردی | مەردایەتی |

| | |
|---|---|
| مەردەمێری | مەردایەتی |
| مەڕە | بۆئێمە ـ (پەرتووکا خۆ ژ مەڕە بینە) |
| مەڕبێڵ | خاکەناس ، بێل |
| مەڕڤان | شوانی مەڕ |
| مەرزەڤان | بڕوانە توخیبڤان |
| مەرڤ | بنیادەم ، مرۆڤ |
| مەرڤات | خزمان |
| مەرقەد | کڵگۆی شێخ و پیاوی گەورە ، مەزار |
| مەرقاندن | تررووکاندن ، بۆ هێلکە |
| مەرقین | تررووکان ، بۆ هێلکە |
| مەرگۆنەك | بڕوانە بانگەر |
| مەرگۆنەك | بڕوانە بانگەر |
| مەرەڤ | خزم ، قەوم |
| مەرەڤ | مرۆڤ |
| مەرەق | مەراق |
| مەرەم | مەبەست |
| مەرەك | ئەو شوێنەی ئامادەکراوە بۆ هەڵگرتنی تووتن |
| مەریسۆك | مژمژە ، نوقڵە مەساسە |
| مەرێس | جوانی شتێك کەبە هۆیەوە بڕازێتەوە |
| مەزات | هەراج |
| مەزاتخانە | هەراجخانە |
| مەزاختن | خەرجکردن |
| مەزاختی | خەرجکراو |
| مەزارگەه | مەزار ، زیارەتگا |

| | |
|---|---|
| مەزبیت | ڕێك و پێك ، تەواو |
| مەزخ | خەرج |
| مەزخاندن | خەرجکردن |
| مەزن | گەورە ، زەلام |
| مەزن | سەرۆکی عێل یان وەلات |
| مەزناتی | گەورەیی |
| مەزنی | مەزنایەتی ، گەورەیی |
| مەزنێ مە | گەورەمان |
| مەزنێ من | گەورەم |
| مەزنی | فیزی ، لووتبەرزی |
| مەزەڵ | ژوور ، ئودە |
| مەزەلك | ژووری بچووك |
| مەزێخ | خەرجکار |
| مەزێخەر | مەزێخ |
| مەزێخگە | بانك |
| مەزیکە | مۆزیك |
| مەزناهی | گەورەیی |
| مەژبۆری | ناچاری |
| مەژك | مێشك |
| مەژگ | مەژك |
| مەژودار | ژیر ، بە ئاوەز |
| مەژولانك | برژانگ |
| مەژۆ | مێشك |
| مەژیرەش | گەمشۆ ، مێشك رەش |

| | |
|---|---|
| مەژی | مێشك |
| مەژی | ئێمەش |
| مەژ بۆر | ناچار ، نا عیلاج |
| مەسانێ | گەمەییێکی منداڵانە |
| مەسین | مەسینە |
| مەش | ئێمەش |
| مەش | رۆیشتن ، رەوت |
| مەشاندن | جێبەجێکردن ، پێکهێنانی کار |
| مەشاندن | ناردن ، ڕەوانەکردن |
| مەشفەن | جێگای مردوو لەسەر شووشتن |
| مەشك | مەشکە |
| مەشویم | شوم ، مەشۆم ، ناپەسەند ، دمۆر |
| مەشیا | رۆیشت ، بۆری ، چوو |
| مەشین | رۆیشتن |
| مەشیان | چوون ، رۆیشتن |
| مەشیان | کاربەجێ هاتن ، قەتیان |
| مەشیاندن | ناردن ، جێبەجێکردن |
| مەشی | رۆیشت ، بۆری ، چوو |
| مەعر | مار |
| مەعرەزەکرن | لێك گۆڕینەوە |
| مەعریفەت | ویژدان ، وجدان |
| مەعیەن | مسۆگەر |
| مەعین | پشتیوان، یارمەتیدەر |
| مەغارە | ژێر زەمین و شوێنی تاریکی ژێرزەوی |

| | |
|---|---|
| مەغەل | حەوشە مەڕ |
| مەغەل | شوێنی نیشتەجێبوونی مەڕو ماڵات لەبیاباندا |
| مەفا | سوود ، قازانج ، مفا ، فەیدە |
| مەفرەق | پۆڵا ، پویلا |
| مەفسك | ئسكی ، كەوچكێكی فافۆنی سەرخڕە بۆ شیولێنان بەكار دەهێنرێت، ئەسكوێ |
| مەڤرەت | بڕبەن ، ئامێری خۆشكردنی دەمی داس و بڤر |
| مەقلیك | تاوە ، دەفری سووركردنەوەی خۆراك تیایدا |
| مەكتەڤ | قوتابخانە ، فێرگەھ ، خوێندنگەھ |
| مەكدەر | چاوك |
| مە كر | كردمان |
| مە كر | ناز |
| مەكرباز | نازو نوزكەر |
| مەكرۆك | فێڵباز ، تەڵەكەباز |
| مەكر | فرت وفێڵ و تەڵەكە بازی و فێڵبازی |
| مەكرباز | فێڵباز ، پیلانگێڕ |
| مەكینە | ماكێنە |
| مەگرتی | گریمان |
| مەلا | زانای ئاینی |
| مەلاڵ | پەشێو |
| مەلختە | كولێكە لە گیای خۆڕسكی، كاتی بڕین بۆ مەڕوماڵات |
| مەلقاندن | فلیقاندنەوە |
| مەلقین | رزینی میوە بەدارەوە |
| مەلك | پادشا |

| | |
|---|---|
| مەلهاخانە | مەلها |
| مەلها | شوێنی رابواردن |
| مەلهەم | هەتوان ، مەلحەم |
| مەلووچك | ئامێز ، باوەش ، هبێز |
| مەلۆك | پڕی باوەشێك لە دەغڵی دوراو ، مەلۆ ، سواله |
| مەلول | خەمبار ، داماو |
| مەلە | شارەزا ـ (ئاری ل کارێ خۆ مەلەیە) |
| مەلە | سۆبایی ، مەلەیی |
| مەلەڤان | مەلەوان |
| مەلەك | فریشتە |
| مەلەڤان | ئاوباز ، مەلەوان |
| مەلەتیك | جۆرە سێوێکە لەکۆتایی وەرزی پائیز و سەرەتای وەرزی زستان پێدەگات |
| مەلیل | خەمبار ، داماو |
| مەلیل | بێزار ، مەلوول ، پەرێشان |
| مەلیاکەت | فریشتە |
| مەلیتك | بەروانە |
| مەم | گوانی ژن ، مەمك |
| مەم | ناوە بۆ پیاوان |
| مەمك | مەم ، مەمك |
| مەمك قیت | مەمك بەل |
| مەمك مژ | منداڵی شیرە خۆرە |
| مەمنوون | سوپاس ، منەتبار |
| مەمۆك | مژۆك |

| | |
|---|---|
| مەمەھ | خۆراك بە زمانی منداڵان |
| مەنجەڵ | بەرۆش ، قازانی گەورە |
| مەنجەڵۆك | بەرۆشی بچووك |
| مەنجەنیق | هێتونی سۆتاندنی مرۆڤ ، جۆرە چەكێكی كۆنە |
| مەند | گیاییێكی كێویە وەكو كەنگر دەیكوڵێنن و دەیخۆن |
| مەند | پڕ ، تەژی |
| مەند | لەسەرخۆ و سەنگین |
| مەندال | مناڵ ، منداڵ |
| مەنداڤ | ئەو شوێنەی كە ئاو تیایدا رادەوەستێت ، بەنداو |
| مەندك | گیای مەند |
| مەندۆك | سەنگینی |
| مەندۆك | بڕوانە مەندك |
| مەندی | جووڵە نەكردنی ئاو |
| مەندێ | گیای مەند |
| مەندیل | پێچی سەر |
| مەندەهۆش | سەر سام ، هەیبەتگرتی |
| مەنقال | مەنقەڵی ، مەنقەڵە |
| مەھ | مانگ |
| مەھ | مەڕ |
| مەھ | شەراب |
| مەهاندن | مەیاندن |
| مەهاندی | مەیاندی |
| مەهانە | بەهانە ، بیانو ، هەنجەت |
| مەهانە | مانگانە |

| | |
|---|---|
| مەهبرن | مانگ تێپەڕاندنی ژنی سکپڕ |
| مەهبەرە | هەرەوەز ، کاری پێکەوە ، زبارە |
| مەهتەر | خزمەتکاری ئەسپ |
| مەهجەت | پێداویست |
| مەهدك | بێشکە ، لانکە |
| مەهدەر | تکا ، رەجا |
| مەهدەرچی | تکاکار |
| مەهر | مارە |
| مەهرکرن | مارەکردن |
| مەهرڤان | ئەوەی کاری مارە بڕین دەکات |
| مەهفۆر | مافوور |
| مەهڤان | میوان |
| مەهك | بێ نوێژی ژنانە |
| مەهکی | مەهك |
| مەهلا | گەڕەك |
| مەهن | ناز کردن |
| مەهوەش | نازدار وەکو مانگ |
| مەهەیر | هەژار ، بێچارە |
| مەهە | شەڕاب،ئارەق،مەی |
| مەهەڤەخۆر | شەڕبخۆر،مەی خۆر |
| مەهیتی | مانگانە |
| مەهیك | مەهبوورین ، وادەی بێ نوێژی ژنانە |
| مەهین | ماین |
| مەهین | مەیین و توند بوونی شیر بە ئامیانێکردن ، مەیاندن |

| | |
|---|---|
| مەهین | مەین ، لەکەمیدان ـ (دەڤێ داسا من مەهی ) ، سوان ، دەسوێ |
| مەهیك | قۆپچە ، قولپك ، بەندۆشك ، دوگمە |
| مەهی | مەیی |
| مەویژ | مێوژ |
| مەیاڤ | تەنك ، باریك |
| مەیان | ناوەند،ناوەراست |
| مەیان | جۆرە ترێیەکە |
| مەیت | لاشەی مردوو ، جەنازە |
| مەیز | تەماشا |
| مەیزاندن | تەماشاکردن ، تێڕوانین |
| مەیزێ | تەماشاکە |
| مەیزین | تەماشاکردن |
| مەیزە | تێڕوانین ، تەماشا |
| مەیزەکرن | تەماشاکردن |
| مەییك | قوپچە، دوگمە |
| مەیل | ئارەزوو ، حەز |
| مەیل | لایەنگر ، تەرەفدار |
| مەیلدار | لایەنگر ، هەوادار ، تەرەفدار |
| مەیلداری | تەرەفداری |
| مەیڤان | ئەوەی کاری مەی دەکات |
| میت | قیتایی ، رەق راوەستان ، (گوهێن ئاری میتن) |
| میتك | قیتکە |
| میتکرن | قیتکرن ـ (ئاری گوهێن خۆ میت کرینە) |
| میتك | گرد |
| میتن | مژین |

| میر | سەردار ، پاشا |
|---|---|
| میرا | بانگکردنی میر ـ (میرێ من میرا) |
| میرات | بۆماوە ، جێ ماوەی کەل و پەلی مردوو ، کەلەپوور |
| میرات | وەچاغ کوێر ـ (مرۆڤەکێ مال میراتە) |
| میراتگر | میراتبەر |
| میراتگری | میراتبەری ، میراتبردن |
| میراتی | سەرداری و پاشایەتی |
| میراش | خاوەن ئاش |
| میراڤ | کەسێ کە دابەش کردنی ئاوی ئاوایی بە دەستە |
| میراتبوون | وەچاخکوێربوون |
| میراتبەر | میراتگەر،میراتگر |
| میراتبەری | میراتگەری |
| میرایەتی | گەورەیی ، پاشایەتی |
| میراتە | میرات ، پاشماوەی مردوو لە کەل و پەل |
| میراتکۆر | وەچاغ کوێر |
| میراتگر | بڕوانە: میراتبەر |
| میراتگری | میراتگەری |
| میرزا | نووسەر |
| میرزا | نەوەی پادشا ، شازادە |
| میرگەھ | میرنشین |
| میری | حکومەت |
| میزدنك | میزڵدان |
| میستن | میزکردن |
| میسمیسك | میزڵدان |
| میشە | زەوی بەیار |

| | |
|---|---|
| میمار | بڕینی موو |
| میمار | دەردێکە تووشی پەنجەکان دەبێت |
| مینا | وەکو ، وەك ، شتی ، چەشنی |
| میناك | وەك یەك ، بۆ نموونە |
| میهرەڤان | میهرەبان، دلۆڤان |
| میناکی | هاوتایی ، نموونەیی |
| میهڤان | میوان |
| مێتن | مژین |
| مێداد | قەڵەم رەساس، قەلەم دار |
| مێدەك | سفرە ، خوان |
| مێر | پیاو، زەڵام |
| مێر | شوو ـ (نازێ مێرکر) |
| مێراتی | پیاوەتی ، ئازایەتی |
| مێرانە | ئازایانە ، پیاوانە |
| مێرانی | ئازایەتی ـ پیاوانە ـ (مێرانی شۆلا خۆ بێژە) |
| مێرخاس | ئازاو چاو نەترس ، بوێر ، قارەمان |
| مێرڤان | پیاو چاك |
| مێرك | کابرا |
| مێرکوژ | پیاو کوژ ، جەللاد |
| مێرگ | چیمەن |
| مێرویك | مێرووڵەی بچووك |
| مێری | مێرووڵەی ، مێروستان |
| مێرینی | پیاوەتی |
| مێرڤان | پیاوچاك ، سەخی ، مەرد |
| مێر | چاونەترس ، بەجەرگ |
| مێزە | روانین |
| مێزەکە | بروانە، تەماشاکە، لێرامینە، هێڤدەرێ، بەرێ خۆبدێ، هەمەتەکە، لێوەستە ، بڕێنە، بنێرە |

| | |
|---|---|
| مێژ | کۆن |
| مێژان | مژین |
| مێژاندن | مژاندن |
| مێژتن | مژین |
| مێژك | مێشك |
| مێژك | ئەوەی شیر دەمژێ |
| مێژۆڤان | مێژوو زان |
| مێژولانك | برژانگ |
| مێژی | مێشك |
| مێژ | نوێژ |
| مێژتن | مژین |
| مێژکەر | نوێژکەر |
| مێژکرن | نوێژکردن |
| مێژین | کۆن، دێرین، دێر زەمان |
| مێش | هەنگ |
| مێشە رەش | مێشۆلە |
| مێشتن | مژتن |
| مێش خەساندن | بێ کار رابواردن |
| مێشك | مێشۆلەی بچووك |
| مێشەڤان | ئەوەی مێشە هنگوین بە خێو دەکات |
| مێشەڤانی | مێشەوانی |
| مێش هنگڤین | هەنگ |
| مێش هنگوڤ | مێش هنگڤین ، هەنگ |
| مێشکهاتن | وروژان |
| مێڤان | میوان |
| مێڤاندار | کەسێ کە میوانی هەیە ، مێواندار |
| مێڤانداری | خزمەت و حەواندنەوەی میوان |
| مێڤانداریکرن | حەواندنەوەی میوان |
| مێڤانی | بەمیوانی چوونە لای کەسێك |

| | |
|---|---|
| مێلاك | جگەر ، جەرگ و هەناو ، کەزەب ، قەزەب |
| مێهـ | مەڕ |
| مێهتن | مژین |
| مێهڤان | بڕوانە: میهڤان |
| مێهڤان خودانکرن | میوان ڕاگرتن |
| مێهڤان حەوین | میوانڕاگر ، میوانحەوێن |
| مێهڤانحەواندن | میوان ڕاگرتن |
| مێهڤاندار | میواندار |
| میهڤانداری | میوانداری |
| مێهڤان دۆست | کەسێ حەزی لە میوانە ، میوان حەوێن |
| مێهڤان ڕێکرن | میوان بەڕێکردن،بەڕێکردنی میوان |
| مێڤان ڕێئێخستن | مێڤان ڕێکرن |
| مێهڤان حەبین | مێوان بەخێوکەر ، مێوانخانە |
| مێڤان نەحەوین | میوان ڕانەگر |
| مێوك | مێو ، داری ترێ |
| مێویژ | مێوژ |
| مێویژان | گوڵێکی بۆن خۆشە |
| مێز | تەختە |
| میکار | مۆکار |
| می | موو ، موی ، تووك |
| می | مەڕ ، یەزی سیی |
| م | من ـ (م زانی ئەم دێ ئازاد بین) ، جێناوی سەر بەخۆیە بۆ کەسی یەکەمی تاك |



| | |
|---|---|
| نا | هێنا ، ئینا، ئانی–(تە پەرتووکا من نا؟) |
| نابە | نابێ ، ناشێ |
| ناچم | ناڕۆم |
| ناچین | ناڕۆین |
| ناخازم | نامەوێ ، حەزم لێ نیە |
| ناخازن | نایانەوێ |
| ناخازین | نامانەوێ |
| ناخازی | ناتەوێ، تە نەڤێت |
| ناخۆیا | نادیار ، بزر ، شاراوە |
| ناخەڤم | دخەوڕا ناچم ، نانوم ، ناخەوم ، نانڤم |
| ناخێوییێتێ | نەپێکانی ئامانج، ئەم وشەیە کاتێك بەکاردێت کە کارێك یان ئیشێك بە هیچ شێوەیەك جێبەجێ نەبێت و خاوەنکارەکەش بەدەستیەوە گیرۆدەبێت. |
| نادەت | نادا |
| نادەتن | ناداتن |
| نادەم | نابەخشم ، نایدەم |
| نازاڤ | نازاو ، تێرئاو |
| نازاندن | بەناز پەروەردەکردن |

| | |
|---|---|
| نازك | ناسك ، باريك |
| نازكەر | ناز فرۆش |
| نازكرن | نازكردن |
| نازكی | ناسكی ، باريكی ، نەرمی |
| نازناڤ | نازناو |
| نازی | بەناز پەروەردەكراو ، ناز كردن |
| نازێ | بێچووی نابێ |
| ناس | ناسياو ، ئاشنا ـ (ئەز ئاری ناس دكەم) |
| ناساندن | پێ ناسین |
| ناسكەنان | نانی تەنكە ، نانی ساج بە ڕوون |
| ناسكرن | ناسینەوە |
| ناسیار | ئاشنا ، ناسیاو |
| ناسیاری | ئاشنایی |
| ناسینەڤە | ناسینەوە |
| نافك | تۆ ، ناوكە شوتی و كاڵەك و كدو |
| نافك | ناوكی لەشی مرۆڤ ، ناوك |
| نافمالی | كەل و پەل |
| ناڤ | ناوەوە ، دەروونی هەر شتێ |
| ناڤ | ناو |
| ناڤاندن | ناو لێنان |
| ناڤاندن | ناونان ، ناو بردن |
| ناڤئانین | ناوهێنان |
| ناڤبار | نێوەندی بار |
| ناڤبارك | نێوی باری بچووك |

| | |
|---|---|
| ناڤبەر | نێوان ، مابەین |
| ناڤبەر | لەناوبەر ، تێبەر ، قرپکەر |
| ناڤبەند | ناوەڕاست |
| ناڤبەین | نێوان ، مابەین |
| ناڤبژن | ناوبژیوان |
| ناڤبژیکار | ناوبژیوان |
| ناڤبژیکاری | ناوبژیوانی |
| ناڤبژیڤان | ناوبژیوان |
| ناڤبژیڤانی | ناوبژیوانی |
| ناڤبژی | نێوبژی،ناوبژی |
| ناڤبژیکەر | ناو بژیکەر |
| ناڤبژین | لەدیوی ناوەوە خاوێن ، ناوخاوێن |
| ناڤبڕ | ناوبڕە ، نێوان بڕ ، لەمپەر |
| ناڤبڕی | ناوەندی دوو شت |
| ناڤبڕك | ناو بڕ |
| ناڤبرن | ناوهێنان |
| ناڤبرن | لەناو بردن ، قەلاچۆکردن |
| ناڤبری | ناوبراو |
| ناڤبریك | پەرژین |
| ناڤبەری | نێو بژیوانی |
| ناڤبەندی | نێو بژیوانی |
| ناڤبریان | ناونەمان ، تەفروتونابوون |
| ناڤبریای | تەفرو تونابوون |
| ناڤبریای | کەسێك ناوی بەتەواوی بسڕێتەوە |

| | |
|---|---|
| ناڤپێدان | ناوبەخشین |
| ناڤتەنگ | کەمەر باریك |
| ناڤتەنگ | ناوەندی لەش |
| ناڤتێدان | دندەدان ، پێهڵگۆتن |
| ناڤجکان | نێوجوان |
| ناڤچاڤ | نێوچەوان ، ئەنی |
| ناڤچاڤ بەش | ناوچەوان بەلەك ، نێو چەوان رەش و سپی |
| ناڤچاڤسپی | شانسدار ، بەبەخت ، بەشانس |
| ناڤچاڤگرێ | رووگرژ |
| ناڤچال | ناوچاڵ |
| ناڤچە | مەڵبەند ، ناوچە |
| ناڤچەر | مێرگی لەوەڕاندنی ئاژەڵ ، شوێنی لەوەڕان |
| ناڤچەر | لەناو چوو |
| ناڤچەق | ناوەڕاست ، ناوەند |
| ناڤچەل | نێو شاخ و چیا ، هەرێمێکە لە کوردستان |
| ناڤچەلی | خەڵکی دەڤەری ناوچەل |
| ناڤچەنگ | بنهەنگڵ |
| ناڤچوون | لەناو چوون |
| ناڤچاڤگرێ | رووگرژ |
| ناڤچەل | ناوشاخ |
| ناڤخۆ | ناوەوە ، هندر |
| ناڤخۆدان | بەخۆهەلگوتن ، خودپەسەندی ، خۆهەڵکێشان |
| ناڤخۆدەر | خودپەسەند ، بەخۆهەڵبێژ ، خۆهەڵکێش |
| ناڤخۆیی | ناوەخۆ ، نێوخۆیی |

| | |
|---|---|
| ناڤدار | بەناو بانگ ، ناودار، بناڤ ودەنگ |
| ناڤداری | بەناوبانگی ، ناوداری |
| ناڤدان | ناولەخۆدان، بەخۆداهەڵگۆتن |
| ناڤدانین | ناو بۆ کەسێك یان شتێك دانان |
| ناڤدەر | بەردەرانە |
| ناڤدەر | ئەوەی بە خۆی هەڵدەڵێت |
| ناڤدەری | ناودەرگا ، ناڤدەر |
| ناڤدەست | بەری دەست ، لەپ |
| ناڤدەشت | دەشتایی لەناو کێواندا |
| ناڤدەنگ | بەناو بانگ |
| ناڤدێر | وشەی پیرۆز بایی بۆ کەسی ناو لەسەر دانراو واتە تەمەندرێژبێ |
| ناڤدێر | بەناوبانگ |
| ناڤدۆك | دارمەشکە |
| ناڤڕا | لەناودا ، تێدا ، پێدا (ئێرە مینن ناڤڕا نەچە) |
| ناڤڕان | نێوان هەردوو ران |
| ناڤڕێك | ناوبڕ ، تیغە |
| ناڤزك | هەناو |
| ناڤسال | نێوان ساڵ ، بەساڵاچوون |
| ناڤسەر | لۆتکە ، دۆند ، ناوەندی سەر ، ترۆپك |
| ناڤشکاندن | بەدناوکردن ، ناوزڕاندن |
| ناڤقەد | نێوەندی باڵای هەر کەسێك یان شتێك |
| ناڤك | ناوکی مرۆڤ |
| ناڤك | تۆی گوڵەبەڕۆژەو خیارو شوتی |
| ناڤکدار | بەتۆو ، ناوکدار |

| | |
|---|---|
| ناڤکەند | نێوەندی چاڵ |
| ناڤکرن | بەناو کردن |
| ناڤگەڕ | ناوگەڕ،بەینی دوو ریز لە دیوار |
| ناڤگەڕ | بەناوبانگ ، ناودار |
| ناڤگەڕی | بەناوبانگی ، ناوداری ، ناوگەڕی |
| ناڤگین | ناوەند |
| ناڤمال | کەل و پەل |
| ناڤمل | نێوشان |
| ناڤنان | ناوهێنان |
| ناڤنەتەوی | نێونەتەوی ، نێودەوڵەتی |
| ناڤنج | مام ناوەندی |
| ناڤنج | ناوەند |
| ناڤودەنگ | بەناو بانگ ، ناودار |
| ناڤۆکی | ناووکی |
| ناڤەڕۆك | ناوەڕۆك ، پێڕست ، کاکلك |
| ناڤەند | ناوەڕاست |
| ناڤێش | دەردی هەناو چوون |
| ناڤین | ناوەڕاست ، مام ناوەندی |
| ناڤێکهەل | تێکەڵاو ، لەناو یەك |
| ناڤێکهەلکرن | تێکەڵاوکردن |
| ناڤی | ناوداری ـ (ئاری تو مرۆڤەکێ خودان ناڤی) |
| ناڤ قۆڵنج | ناوشان |
| ناڤ لخۆدان | خۆ هەڵکێشان |
| ناڤ ناڤە | بەین بەینە |

| | |
|---|---|
| ناڤ قەدتەنگ | ناوقەدباریك |
| ناڤ قەدتەنگی | ناوقەد باریکی |
| ناڤێ | نایەوێ |
| ناڤێ | ناونجی ، ناوەند ـ (ئەز برایێ ناڤێ مە) |
| ناڤین | ناوەند، ناوەڕاست |
| ناقابل | لێنەهاتوو ، ناشایستە |
| ناقایل | نا رازی |
| ناکەت | ناکات |
| ناکی | ناکەی، ئەنجامی نادەی؟ |
| نال | پێڵاوی یەکسم لە ئاسن |
| نال | نەعل ، پێڵاو ، شمك |
| نالاندن | ناڵە ناڵە (ئازار) |
| نالکرن | ناڵکردن |
| نالەنال | ناڵەی زۆر |
| نالبەند | سمتاش، ناڵبەند ، ئەوەی وڵاغ ناڵ دەکات |
| نالبەندی | سمتاشی |
| نالیك | ناڵاندن |
| نالیك | شمەکی راخستن ، دۆشەك |
| نالین | ناڵەکردن |
| ناندە | ناندەر ، مرۆڤی سەخی و مەرد |
| ناندەر | ناندە |
| ناندەیی | سەخیبوون ، مەردایەتی |
| نانگیر | ئەو زەوییەی بە چاکی گەنم و جۆی لێ شین دەبێت |
| نانەخار | داشکاندن |

| | |
|---|---|
| نان پاتن | نان کردن |
| نان پێژ | نانکەر |
| نانێ ترسی | بەتەنیا نان ـ (نانێ منێ ترسییە ، زکێ منێ برسییە ) |
| نانێ سێلێ | نانی ساج |
| ناهلیك | دۆشەك |
| نتلاندن | نەخشاندن |
| نتلاندی | نەخشاندی |
| نچار | بێچارە ، ناچار |
| نچیر | راو |
| نچیرڤان | راوکەر |
| نخافتن | داپۆشین ، داپۆشتن |
| نخاڤ | داپۆش |
| نخامتن | داپۆشین ، پەردە پۆشکردن |
| نختە | هاتنی باران |
| نخرین | نۆبەرە |
| نخری | نۆبەرەی منداڵ چ نێر چ مێ |
| نخێڤ | داپۆش |
| نخێڤ | پۆشاك |
| نڕەنڕ | نەڕەی شێر |
| نڕین | دەنگی سەگ کاتی پەلاماردان |
| نرکاندن | ناڵاندن |
| نرکەنرك |ناڵەناڵ |
| نزا | نازانم، نزانم؟ |
| نزاڤ | شێدار |

| | |
|---|---|
| نزانی | نازانی |
| نژار | وەستای دیوار |
| نژاندن | ئاواکردن ، بەناکردن |
| نژاندن | لەسەر یەکتر کەلەکەکردن |
| نژاندن | لەسەر یەکدانان ، نژنین |
| نژدەڤان | نەژدەوان |
| نژدە | تالانکەر ، رێگر |
| نژدە | نەژدە ، رێگر ، چەتە |
| نژدەڤان | نەژدەچی |
| نژن | لەسەر یەکدانان |
| نژناندن | بیناکردن |
| نژنکاری | ئاوەدانکاری |
| نژنین | نژاندن |
| نژنی | تەنی |
| نژیار | وەستای دیوار |
| نژیارڤان | شارەزا لە دیوار کردن |
| نساخ | نەخۆش |
| نساخی | نەخۆشی |
| نشا | نشاستە |
| نشدار | دلێر |
| نشك | لەپڕ ، کتوپڕ ، ژگرڤە |
| نشکا | نشك |
| نشکاڤ | نشك |
| نشکاڤك | لەپڕ ، لەناکاو |

| | |
|---|---|
| نشکاڤی | کتوپڕ ، لەپڕ |
| نشکێڤە | لەپڕا ، کتوپڕ ، لەناکاو |
| نشگاڤ | لەناکاو ، لەپڕێکا |
| نشۆڤ | نشێو |
| نشۆڤ | لێژایی ، سەر بەرە ژێر ، نشێو |
| نشیان | نیشتن |
| نشیڤ | لێژایی ، سەر بەرە ژێرە ، نشێو |
| نشیڤی | لێژی |
| نفر | نەفرەت |
| نفرین | نەفرەت |
| نفش | نەوە ، وەچە ، رەگەز |
| نفشی | نەوە ، وەچە ، هۆز گەرا |
| نفش پەرێس | رەگەز پەرست |
| نفۆس | ژمارەی دانیشتووان |
| نفۆس | ناسنامە |
| نڤ | خەو ، خەڤ |
| نڤا | خەوت ، نووست ، رازا |
| نڤار | نۆژەن ، نوێ ، تازە |
| نڤان | خەوتن |
| نڤاندن | خەواندن |
| نڤرژاندن | تێڕو پڕ لێدان ، نەرمکردن |
| نڤز | نزم |
| نڤزبوون | نزمبوون |
| نڤزکرن | نزمکردن |

| | |
|---|---|
| نڤژاندن | تێرو پڕ لێدان |
| نڤست | نووست ، خەوت |
| نڤستاندن | خەواندن |
| نڤستن | خەوتن ، نووستن |
| نڤستی | خەوتوو |
| نڤش | جۆر ، رەگەز ، تۆرەمە |
| نڤشت | نوشتە |
| نڤشت | پەرتووک ، کتێب |
| نڤشتووک | نوشتە |
| نڤشتووک | کتێب ، پەرتووک |
| نڤشتی | نڤشت |
| نڤشك | کەرە |
| نڤیس | نووسراو |
| نڤیسار | نووسراو |
| نڤیسان | نووسین |
| نڤیساندن | نڤیسان |
| نڤیسای | نووسراو |
| نڤیسەری | نووسەری |
| نڤیسەڤان | نووسەر ، نڤیسکار |
| نڤیستن | نووسین |
| نڤیسگە | نووسینگەھ |
| نڤیسك | بەڵگەی نووسراو |
| نڤیسکی | وەڵامی دەق بە نوسراوی |
| نڤیسین | نووسین |

| | |
|---|---|
| نڤیسڤان | نووسەر |
| نڤیشك | کەرە |
| نڤین | کەل و پەلی تێ خەوتن |
| نڤین نخێڤ | پەردەی نوێن |
| نڤینۆك | قەرەوێڵە ، تەختەی نووستن |
| نڤینۆك | ئەوەی کەسێك دەخەوێنێت |
| نڤینك | نوێن |
| نڤێژ | نوێژ |
| نڤێژکەر | نوێژ خوێن |
| نڤێژکەری | نوێژخوێنی |
| نڤێژگە | مزگەوت |
| نڤێژی | بەدەست نوێژ، خاوێن ، نوێخوێن |
| نفرین | نزا ، دوعا |
| نقار | نەقار ، وەستای نەخشاندنی بەرد بۆ خانوو |
| نقارم | ناتوانم ، ناشێم ، پێمناکرێت |
| نقاری | ناتوانی |
| نقاری | کاری نەخشاندنی بەرد |
| نقارین | لەدەست نەهاتن ، نەتوانین |
| نقاندن | لەزەویدا بردنە خوار ، چەقاندن ـ(ڤان سنگا بنقینە) |
| نقاندن | چوقاندن ، نوقاندن ـ (چاڤێن خۆ بنقینە) |
| نقراندن | نەخشاندنی بەرد |
| نقرۆشك | وەنەوز ، خەونۆچکە ، نکروسك |
| نقوڤان | خۆنقومکار |
| نقۆ | نغرۆ، نقوم ، چونە ژێر ئاو |

| | |
|---|---|
| نقۆبوون | نغرۆبوون |
| نقۆم | نغرۆ |
| نقیان | قوچان |
| نقیان | لەزەویدا چوونە خوار |
| نقێن | نقە ، جمە ، دەنگی قەڵەبالغ ، جەنجاڵی ـ (دیوانخانا ئاغا هێشتا نقێن ژێدهێت) |
| نك | کن ، لای ، جەم |
| نکارن | ناتوانن، ناشێن |
| نکاندن | ناڵاندن |
| نکخۆ | لە خۆیەوە ، لە کنەخۆ |
| نکراندن | کۆڵین |
| نکڤەبرن | بردنەلای |
| نکڤەچوون | چوونە لای ، چوونە کنی |
| نکل | دەنۆك |
| نکلاندن | بەدەنۆك لێدان |
| نکنك | نرکەنرك ، ناڵێن |
| نکەنك | نکەو ناڵەی زۆر |
| نمنمۆك | پەپۆلە |
| نمیان | خووسان |
| نمێژگەه | مزگەوت ، شوێنی نوێژکردن ، نوێژخانە |
| نها | ئێستا، نهۆ، نوکە، نەها |
| نهال | دۆڵ ، شیو |
| نهانبوون | بڕوانە نەهانبوون |
| نهانکرن | سەرگرتن ، نخافتن |

| | |
|---|---|
| نهانی | جێگەی حەوانەوەو حەسانەوە ، ئاوەدانی |
| نهانی | لانەوبانە ، شوێنێك کە لە سەرماو گەرما بتپارێزێ |
| نهش | بێهۆش |
| نهشت | نیشت |
| نهشتن | نیشتنەوە |
| نهشتی | نشتوو |
| نهقا | لەناکاو ، لە پڕێکا |
| نهك | نۆك |
| نهوین | کارێز ، نهون |
| نهۆ | ئێستا |
| نهە | ئێستا ، ئێستە |
| نهە | ژمارە نۆ |
| نهەنگ | نەهەنگ ، ماسی زۆر گەورە ، حوت |
| نهیار | نیشتن |
| نهێڕان | روانین ، نواڕین |
| نهێڕتن | روانین ، تەماشاکردن |
| نهێڕین | روانین ، تەماشاکردن |
| نهێڕین | نواڕین ، ڕوانین |
| نوخوماندن | داپۆشاندن |
| نوخومین | داپۆشین |
| نوڕی | هاوار |
| نوڕپیهێلان | هات و هاوار کردن ـ (چما تو ڤان نوڕپیا دهێلی ؟) |
| نۆژدارگەھ | نۆرینگەھ ، سەردانگە |
| نۆشدار | پزیشك |

| | |
|---|---|
| نوڤەر | نۆژەن |
| نوڤە | سەرلەنوێ |
| نوڤەکرن | تازەکردنەوە |
| نوکل | دەنوك ـ (نوکلێ قەزمێ من شکەست) |
| نوھ | نوێ |
| نوھا | ئێستا |
| نوھال | شیوە، دەرە،دۆڵ |
| نوھان | جێگای حەوانەوەو حەسانەوە |
| نوھانبوون | بڕوانە نەھانبوون |
| نوھت | نەوەد |
| نوھت | پێکا ، هەنگاوت |
| نوھتن | پێکان ، هەنگاوتن |
| نوھك | نۆك |
| نوھە | ئێستا |
| نوھێل | گەلی ، شیو |
| نوھین | کارێز |
| نوھی | تازەیی ، نوێ یەتی |
| نووچە | هەوال، دەنگوباس، خەبەر |
| نووچەبێژ | بێژەر ، بێژیار ، دەنگوباس خوێن |
| نووچەبێژی | بێژەری ، دەنگوباس خوێنی |
| نووچەڤان | پەیامنێر |
| نووچەڤانی | پەیامنێری |
| نووکە | هەنووکە ، ئێستا |
| نوونەر | نوێنەر ، نەمایندە |

| نویچە | هەواڵ ، دەنگوباس |
|---|---|
| نویز نویز | نوزە نوز |
| نویزێن | نوزە |
| نویزین | وڵاغێکە کە تازە زینی لێکرابێ |
| نویز نویز | سوکە گریان |
| نویژەن | نۆژەن |
| نویسان | نوسان |
| نویساندن | بەبێ تەماشاکردنی ئەم لاو ئەولا رێگای خۆیان گرت و رۆیشتن |
| نویساندن | لکاندن |
| نویسەك | لینج |
| نویسیان | نوسان ، رۆیشتن |
| نویسیان | لکان |
| نویسەك | چەسپاو |
| نویشان | نیشانە ، هێما |
| نویڤەبوون | نوێ بوونەوە |
| نویکەند | نوکەند |
| نویڤەکار | کاری بەنیوە ، نیوەکاری |
| نویکرن | نوێکردنەوە |
| نویکرنەڤە | نوێ کردنەوە |
| نوی | تازە ، نوێ |
| نوی هەیڤ | مانگی نوێ |
| نۆبانێ | بەنۆرە |
| نۆبوون | تازە بوونەوە ، نوێ بوونەوە |
| نۆبە | ئێشك ، پاسەوانی |

| | |
|---|---|
| نۆبەت | نۆرە ، ئێشك |
| نۆبەدار | ئێشكچی ، نۆرەگر |
| نۆبەداری | پاسەوانی ، زێرەڤانی |
| نۆت | نەوەد |
| نۆختە | رۆژی باران و بەفر |
| نۆزێن | نوزە |
| نۆژدارگەه | شوێنی نیشتەجێ بوونی پزیشكان |
| نۆژدار | پزیشك |
| نۆژین | ژیانێكی نوێ |
| نۆڤ | نوێ ، تازە |
| نۆڤین | خۆشەویستیەكی سەر لەنوێ |
| نۆقیبوون | رۆچوون ، نقوومبوون |
| نۆقیكرن | نقوومكردن |
| نۆكە | ئێستا ، هەوكە ، ئێستە ، نها ، نهە ، نهۆ ، تازە |
| نۆكەیی | هەنۆكەیی |
| نۆلا | وەكو ، چەشنی ، مینا |
| نۆڵ | وەك ، وەكو |
| نۆهك | نۆك |
| نۆهۆ | ئێستا |
| نۆهەت | نەوەت |
| نەباش | خراپ |
| نەبالغ | منداڵ ، پێ نەگەیشتوو، نەسەبقی |
| نەبناڤ | بێ دەنگ و ناو ، بەناو نەكراو |
| نەبهیس | كەڕ |

